# جیهانێکی وون





بەکر غەریب بەرزنجی

# جیهانێکی وون

لە نووسینی

بەکر غەریب بەرزنجی

چاپی یەکەم

١٩٧٨

چاپخانەی ئەسعەد بەغداد

## پێشکەشە بـە :ـ

شـێخ عبدالرحمن شـێخ عبدالـکریم البرزنجی
ئیمام و خەتیبی مزگەوتی ئازادی

ب • ع • ب

# پێشــەکی

لە کاتێکدا کە گەلی ئیسلام بە قۆناغێــکی
زۆر تەسکو پڕ لە مەترسیدا دەروات
لە کاتێکدا کە دوژمنانی ئیسلام بیرو باوەری بۆگەنیان
لە نێوان کەلەنی گەنجەکانمــــان بلاودەکــەنەوە ، وا
خەریکن بــە دروشمەی رەنگاورەنگ و بریقەدار بێنــە
پێش بە چاکمزانی کە لەم قۆناغەدا ـجیهانێکی ورنـ
بخەمــە بەرچاوی گــەلی کورد تاکو بــاشتر ئاگادار
بێتەوە لەو چەکە بە توانایەی کە خوای گەورە بــۆی
ناردوە

ئەگەر دوێنێ لە شەری ـ خەندەق ـ دا دوژمنانی
ئیسلام ـ٣ـ بەش بورن ، ئەوا ئیمرۆ نوێنەری هــەر
ـ ٣ ـ بەشەکە لەسەر چۆکن

جولەکەکان ، کە ئیمرۆ ئیسرائیلی رەگــــەز
پەرستە .

گاورەکان    کە ئیمرۆ ئیمپریالیزمی رۆژهەلات‌و
رۆژئاوایە
دووڕووەکان – منافقون – ، کە ئەو موسولمانانەن
بە ـ وراثە ـ و بە جوغرافیا ئیسلامن
کەواتە تێکۆشانی ئیمرۆمان کەمتر نیــە لــە
تێکۆشانی – خــەندەق – دا ، دەسـا ئـەی خاوەن
بەهرەکان دەنگتان رێك خــەن‌و نیـازتات یــەك بێت ،
قورئانی پیرۆز بکەنە راپۆرتی رامیـــــاریتان و نەیەلن
مادیە سەرلێ شێواوە بێ رەگەکان دەنگ هەلێنن
خاکی بەرینی ئیسلامیان لێ بکەنە گۆرەپان ٠
ـ وکان حقا علینا نصر المؤمنین – ٤٧ – الروم
سەرکــەوتن هەر بەدەست خوای گەورەیــە و
خوای گەورەش گەلی ئیسلام سەر دەیەخێت

١٩٧٧_١٠

# المقدمة العربية

فرحان البغدادى بۆ جیهانیکی وون دەدوێت

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على اشرف الخلق اجمعين نبينا محمد وآله الطيبين الطاهرين واصحابه المنتجبين وبعد

لكل نبي من الانبياء معجزة ، والمعجزة هي ما يأتي به النبي من عمل يخرق به نواميس الطبيعة وقوانينها ويعجز عن ذلك غيره • ويجب ان يعترف العلماء المتخصصون بموضوع المعجزة بان هذا العمل اعجاز لا يمكن اجراءه طبيعيا لانهم اعرف الناس بأسس المسألة واصولها واعترافهم يغني عن اعتراف بقية الناس

لذلك اقتضت حكمة الله تعالى على ان يخص كل نبي بمعجزة تشابه الصنعه المعروفة والمشهورة في زمانه

والتي يكثر علماءها واساتذتها في ذلك العصر لـــكي
تكون المعجزة اقوم للحجة واقرب للاعتقاد والتصديق
فموسى (ع) خصه الله بالعصى لما كـــان مـــن كثرة
السحرة في زمانه والـــذين اصبحوا اول المؤمنين بـــه
وبرسالته لما رأوه من انقلاب العصى الى ثعبان تأكل مـــا
يأفكون ثم ترجع الى حالتها الاولى واعترفوا بأيمانهـــم
في مجلس فرعون رغم خوفهم من وعيد فرعون وعقـــابه
وسخطه

وخص الله نبيه عيسى (ع) بأحياء الموتى ( باذن
الله ) وابراء الأكمه والابرص لما كان في عصره مـــــن
اشتهار الطب وازدهاره حيث عجز جميع الاطبـــاء
عن ذلك ليعترفوا بمعجزة عيسى (ع) ويعتقدوا برسالته
التي ارسله الله تعالى بها .

وحيث ان العرب اهتموا واشتهروا بالفصاحـــة
والبلاغة والفنون الادبية بأنواعها حيث اقاموا الندوات
والاسواق كسوق عكاظ وكتبوا القصائد السبعةبالذهب

وعلقوها على جدران الكعبة اعتزازا وافتخارا منهم بالبلاغة والآداب

لذلك ارسل الله نبيه الكريم محمد (ص) بمعجزة تحدت عظمة قريش وبلاغتها وصولتها الادبية فكان القرآن الكريم هو معجزة الرسول (ص) والذى امتاز ببلاغته واعجازه وتشبيهاته الفريدة والتي تحير بها اساطين الفصاحة والبلاغة واعترفوا بانه كلام الله وليس كلام بشر حيث عجزوا عن الاتيان بسورة قصيرة من مثله بعد ان تحداهم بقوله : (وان كنتم في ريب مما نزلنا على عبدنا فأتوا بسورة من مثله وادعوا شهدائكم من دون الله ان كنتم صادقين ) (البقرة)

واذا كان القرآن تحدى قريشا فهو لازال وسيبقى يتحدى الاجيال باعجازه واساليبه ، فمنذ ما يقارب من الف واربعمائة سنة وليومنا هذا ، والكتاب والمفسرون يكتبون الالاف من المجلدات الضخمة عن القرآن وعلومه ومعطياته المختلفة ولازال الجميع يعترفون بانهم قاصرون عن فهم القرآن على حقيقته لانه عالم مجهول .

والحق انه (عالم مجهول) ولو لم يكن كذلك لما جعله الله رسالة ونظاما خالدا تدرسه البشرية على الدوام حتى يرث الله الارض ومن عليها

وفي كل فترة ، ومع استمرار التقدم العلمي والحضارى ، نتطلع الى اوجه جديدة من اوجه الاعجاز القرآني

وبعد ان اعترف علماء الفيزياء والكيمياء والفلك والوراثة والاحياء بوجود صور واشارات علمية في القرآن لم يكتشفها العلم الا حديثا • وبعد ان تعرف الناس أكثر فأكثر على هذه الاشارات والحقائق جاء العلم الحديث وخصوصا علم الحاسبات الالكترونية ليكشف الاعجاز العددى للقرآن وقد كتبت ولا زالت تكتب البحوث الكثيرة في هذا المجال ومن الذين كتبوا في ذلك الاخ الشاب السيد بكر السيد غريب فكتب هذا الكتاب والذى سماه (العالم المجهول) • والذى خصصه لدراسة الاعجاز العددى للقرآن واستقصاء ما كتبه العلماء في ذلك • وحقاً ان هذا النصر الجديد الذى

حققه العلم للقرآن انما جاء كضربة قاضية الى الماديين الملحدين الذين يقولون ان القرآن هـو مؤلف الفـه محمد كما تؤلف الكتب والاساطير الاخرى وهذا الاعجاز العلمي اثبت ان القرآن ليس كلام محمد (ص) هـذا الرجل الامي بل انه فوق طاقة البشرية جمعاء وانه كلام الله وان هذا النصر وعد الله به المؤمنين والصالحين والدعاة اليه بقوله ( انا لننصر رسلنا والذين امنوا في الحياة ويوم يقوم الاشهاد )

جعلنا الله من الدعـاة اليه والقادة الى سبيله ووفق العاملين لاجله والشباب المجاهدين انه نعم المولى ونعم النصير

الكاظمية المقدسة – فرحان عبد علي البغدادى

١٩٧٧-١٠-٢١

# کەتەلۆك

لە ئێمەدا نیە کــە شوشە دەرمانێــکی
نەدیبێ ، هیچ شوشە دەرمانێکیش نیــە
بەبێ کەتەلۆك ـ کاتالۆج ـ بێت ، کـەتەلۆك پێمـــان
دەلێت ، ئەم دەرمانە لە شـــاری - A - دروست
کراوە ، کۆمپانیای - B - دروستی کردوە ، لـــە
مـــادەی - C - پێك هاتووە ، بۆ نەخۆشی - D -
دەشێت ، بۆ نەخۆشی - E - ناشێت ، لەکـــاتی
- F - بەکاری بێنە و ، و ، و ، هتد ٠

وەنەبێت تەنیا دەرمان کەتەلۆکی تایبەتی خۆی
هەیە ، بەلکو هەموو شتێك لەم بوونەوەرەدا ـ الکون ـ
کەتەلۆکی تایبەتی هـــەیە بەفرکـــەر ، ئۆتۆمبێل
دەراسە هــەتا پێرستی ـ فهرست ـ پەرتوکیش ،
کەتەلۆکی پەرتوکە ٠

باشە کە زانیمان هەموو شتێك لــەم بوونەوەرەدا

کەتەلۆکی تایبەتی هەیە ، تۆ بلێی ئەم بوونەوەرە خۆشی کەتەلۆکی نەبێت ؟ !

بەلێ بوونەوەریش وەکو ، بەفرکەر تەلەفزیۆن ، سۆبە ، کەتەلۆکی هەیە ، قورئانی پیرۆز بەلێ قورئانی پیرۆز کەتەلۆکی ئەم بوونەوەرەیە هەر لەو ئەستێرە جوانەی کە پێی دەلێن - ئەستێرەی ئادەمیزاد - تا گەورەترین ئەستێرە و تا بچوکترین ئەستێرە ، بەوشتانەی کە لە ناویانەو لە سەریانەو لە نێوانیانە ، شوشە دەرمانێکن ئامێرێکی کشتوکالین ، قورئانی پیرۆز کەتەلۆکیەتی

ئادەمیزادی ژیر کرنۆشی بۆ ئەم راستیە بردوە و کرنۆشی بۆ دەبات

بۆ ئەوەی زیاتر لەگەل بێگەردی ئەم هاوکێشەدابین بفەرموون لەگەلماندا باپەردە لەسەر ئەم پیشانگایە لابدەین تاکو لەگەل چەند تایبۆیەکی ووندا بدۆیین لە خوای گەورە دەپارێمەوە کە سەرمان بخاتو

پشتمان بگرێت تاکو لە چەند پیشانگایەکی تردا پێك بکەینەوە ٠

# نامەیەکی ئەزەلی

## قورئانی پیرۆز چیە ؟

تاکـە نامەیەکی ئەزەلیە(١) لـــەم بونەوەرەدا رۆژ ، مانگ ، H20 ، مادە ، ئادەمیزاد ، بوونەوەر ئەزەلیینیو کۆتاییان هەیە ، بەلام قورئانی پیرۆز چـۆن سەرەتای دانانی نازانرێت ئەوهاش کۆتاییەکـــەی نازانرێت

قورئانی پیرۆز لـە ماوەی ـ ٢٣ ـ سالدا هاتۆتـە خوارەوە ، کە لە سالی – ٦١٠ز – دەست پێدەکـــات تا سالی ـ ٦٣٣ز ـ ، لـە ـ١١٤ـ سوورەت پێك هاتووە ، ژمارەی ووشەکانی – ٧٦٤٤٠ ـ ووشـەیە ، ژمارەی پیتەکانی ـ ٣٢٣٦٧١ ـ پیتە ، وە ـ٦٦٦٦ـ ئایەتە ، لـــە شاری مەککە(٢) و لـــە شاری مەدینەدا

هاتۆتە خوارەوە ، لە ماوەی ـ١٣ـ ســـالی بەرایی‌دا ـ٨٦ـ سوورەت لە مەککەدا هاتۆتە خوارەوە ، وە لە ماوەی ـ١٠ـ سالی دوایی‌دا ـ٢٨ـ سوورەت لـە مەدینەدا هاتۆتە خوارەوە

ئەگەر تائیمرۆ موسولمانان پێناســـەی قورئانی پیرۆزیان بەم شێوەیە دەکرد ، ئەوا ئیمرۆ لـــە دوای سالی ـ١٩٦٥زـ دا ڕوویەکی تر لە پێناســـەی قورئانی پیرۆزدا دۆزرایەوە کـــە ـیەکسانیـــە هاوکێشیە – التوازن ـ لە نێوان ئەو ووشانەی کـــە پێچەوانەی یەکترن ، وە لە دوای سالی ـ١٩٧٠زـدا ژیری ئەلەکترونی خـــۆی رەپێش‌کردو ـ اعجاز ـی دارشتنی قورئانی پیرۆزی بۆ گێڕاینەوە

من نالێم لە ١٠٪ لە ئێمەدا ئەم پێناسەیەی نەدیوە و نەبیستوە ، بەلکو دەمەوێت پێگەوە لە ســەر کەناری یەکسانی و نهێنی دارشتنی پیشـەکانی پچر پچر لـــە قورئانی پیرۆزدا ســەیری دەریــای ، دەریــای بێبنی

قورئانی پیرۆز بکەین ، تاکو زیاترو باشتر لە گەورەیی ئەم ـ موعجزەـ گەورەیە بگەین ٠

ئێمە ناتوانین بە چاکی جێـگا بۆ قورئانی پیرۆز بکەینەوە تاکو ئاورێك لە مێژوو نەدەینەوە ٠

خـــوای گەورە کـــە ئادەمیزادی(٣) ئاردە سەر ئەم خاکە بەتەنیا نەی‌نارد ، بەلکو لەکاتی پێویست‌و بۆ شوێنی پێویست پێغەمبەرەکانی(٤) هـــەناردە ناویان تا ببنە چرای ڕووناکی لە ڕێـگای ژیانیـــان و وەپشتی ئەم پێغەمبەرانەی دەگرت بە ئامە پیرۆزەکانی ـ قورئان ـ زەبوور ئینجیل تەورات کـــە بیکەنە پرۆگرامی ڕۆژانەی ژیانیان‌و بۆ هەمـــوو پێویستیەك تیایدا بگەرێن ، تاکو کۆمەلێکی بەختیار پێك بهێنن ٠

بەلام ئەوەی جێـــگای شانازیە لێرەدا بوترێت ئەوەیە ، پێغەمبەرەکان بۆ لای تاکـــە نەتەوەیەك یان گەلێك دەهاتن و نامەکەشیان هەر بۆ نەتەوەکەیان بوو بەس

ـ لقد ارسلنا نوحا الى قومه ـ٥٩ـ الاعراف

ئەمە لە بارەی نوح (ص) پێغەمبەردا ، بەلام لـــە بارەی صالح (ص) پێغەمبەردا .

ـ ولقد ارسلنا الى ثمود اخاهم صالحا ـ٤٥ـ النمل

وە لە بارەی موسا (ص) پێغەمبەردا :ـ

ـ ولقد ارسلنا موسى بئاياتنا الى فرعون وملأيه ـ٤٦ـ ـ الزخرف

وە لە بارەی عیسا (ص) پێغەمبەردا :ـ

ـ واذ قال عيسى ابن مريم يابني اسرائيل انى رسـول الله اليكم ـ ٦ ـ الصف

بەلام پێغەمبەری خۆشەویستمان محەمەدی کوری عەبدولا ـصـ جیاوازیەکی زۆری هەیە لە بارەی بانگ کردنی ئادەمیزادەوە لەگەل پێغەمبەرەکانی پێش خۆی ، محەمەد تەنیـا بـۆ نەتەوەیەکی تایبـەتی و گـەلێکی دیارکراوە نـەهـاتوە ، نامەکـەشی کـە ـ قورئـانی پیرۆزە ـ تەنیا بۆ نەتەوەیەکی تایبەتی نیە ، بەلـکو محەمەدو نامەکەی بۆ لای ئادەمیزاد هاتووە بەگشتی

بۆیــــه قورئانی پیرۆز زۆر بەگەرمی ئاگادارمـــان دەکاتەوە :ـ

ـ وما ارسلناك الا رحمة للعالمین ـ١٠٧ـ الانبیاء

وما ارسلناك الا كافة للناس بشیرا ونذیرا ـ٢٨ـ سبأ

ـ قل یاایها الناس انی رسول الله الیـــکم جمیعـــا ـ١٥٧ـ الاعراف

لێرەدا گەورەیی محەمەد خۆی رەپێشدەکـات محەمەد داوا لە یەکێك ناکات کە خواکـەی ـبتەکەیـ بشکێنێ و بروا بە خوای گــــەورە بـــکاتو بێتە ژێر سێبەری ئایینی ئیسلامی پیرۆز ، داوا لە ـ١٠ـ کەس ناکات ، لە قوریشەکانو کوردو عەرەبو فورس ناکات بە تەنیا ، بەلکو داوا لە هەموو ئادەمیزاد دەکات کـــە بروا بە خوای گەورە بێننو ببنە موسولمان

راپەراندی ئـەم کارە گرنگـە بۆ چ محەمەدێك باشە ، لە فورسەکـــان بێت چونـــکە خاکێکی زۆرو سوپایەکی زۆریان هەیە ، لە رۆمەکان بێت کــــە زۆر

زەنگینن زۆر بەهێزن ، لە دەولەمەندەکانی مەککەو یەمەن بێت باشە ؟

بەلام خوای گەورە بۆ ئەوەی کە بۆمان روون بکاتەوە کە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە ، سەیرکەن ، سەیرکەن ئەم کارەگرنگە بە چ محەمەدێك رادەپەرێنێت •

بە محەمەدێك کە بابو براو کوری(؟) نیە وەکو دیواری پۆلایین لە پشتی بوەستن ، بە محەمەدێك کە دایكو خوشکی نیە نازی بچێژنو سووری بکەن لەسەر بەردەوامبوون ، بە محەمەدێك کە مالی نیەو لە مالی باپیرو مامیدا گەورە بوە،خاوەنی هیچ سامانێك نیە کە بیکاتە ماوەر بۆ پروژاندنی ئەو کۆسپو تەگەرانەی کە دێنە سەر رێی ، بە محەمەدێك کە نەخوێندەوارە ، کە زۆربەی زۆری خزمو کەسەکانی تێنون بە خوێنی ، بەلێ بەلێ بەم جۆرە محەمەد دابەزیە گۆرەپانی تێکۆشان ، چ تێکۆشانێك کە چاو لە چاوی هەموو

خوا نەناسێك دەنێت لە ڕووی زەمین چ پاشا بێت چ گەدا ، چ بەهێز بێت چ بێ‌هێز •

گرد بوونەوەی ئەم هەمـــوو ژانە کۆمەلایەتی‌و ئابوریانە لە محەمـــەدو وەستان بە ڕووی هـــەموو گاورێکی سەر ئەم خاکـــە ، وسەرکەوتنێکی وارێك‌و پێك ، وانەیەکە ، وانەیەکـە بۆ ئادەمیزاد کە بزانێت خوای گەورە دەسەلاتی بەسەر هەموو شتێك‌دا هەیە محەمەد لەم جەنگە دژوارەدا چ چەکێکی لە دەست بوو چ جۆرە توانایەکی خستەکار بۆ ئەم کۆدەتایە لـــە هەموو ڕووەکانی ژیانی ئادەمیزاد •

بەلێ قورئانی پیرۆز تاکە چەکی محەمەدو یارانی محەمەد بوو کە بووە هـــۆی سەرکەوتنیان ، قورئانی پیرۆز بوو بە تیشکی گامە کە رەق‌ترین دلی نەرم‌کـرد - نیاز لە دلی عومەری کوری خەتابە پێش ئیســـــلام بوونی - قورئانی پیرۆز بوو کە سەرچاوەی ســەدان لبیـــد(٦) ووشك کرد بە هێزی دارشتن‌و جـــوانی و بەرزی واتاکەی ، قورئانی پیرۆز بوو بەدانیشگایەك بە

هەزاران هەزار ئادەمیزادی ژیری پێگەیاند کە لە پێناوی بەرزەوەندی ئادەمیزاددا کاربکەن بوومەلەرزەیەکی وا مەزن بوو کە کۆشکی زۆرداری لە رەگدا دەرهێنا ، ئەو ناڵە گەورەیە بوو کە -١٤٠٠- ساڵە لە دڵی بێباوەڕەکاندا لە دەنگ نەکەوتووە و -١٤٠٠- بلیۆن بلیۆن ساڵی تریش لە دەنگ ناکەوێت، ئەگەر دوێنێ - ئەبو لەهب و ئوبەی کوڕی خەلەفی - پێکا(٧) ئەوا ئیمرۆ قومبەلەیەکی نیۆترۆنە رۆژێ سەدان جار لە دڵی ماددی و وجودیە بێرەگو سەرێ شێواوەکاندا دەتەقێتەوە زەمینی واپانو بەرینی لێکردونە بە کونە مشك ، دەست بۆ هەر شتێك درێژدەکەن هاوار دەکات(٨)

لا اله الا الله محمد رسول الله

ئەگەر دوێنێ پۆل پۆلو تاكو جووت ئادەمیزاد خۆی دەگەیاندە ژێر سێبەری ئیسلام ئەوا ئیمرۆ ئەوا ئیمرۆ ئامێری ئەلکترونی بە هەموو ئەتۆمەکانیەوە کڕنۆش بۆ گەورەی قورئانی پیرۆز دەبات کە تەنیا

تاکه نامەیەکی خوای گەورەیە ٠

کەی ، کەی لە توانای من دا هەیە ، کەی ، کەی لە توانای ئادەمیزاد دا هەیە کەی ، کە بتوانێت مـافی خۆی بـــە تەواوی بداتە کارێك کە خوای گـــەورە بیـکات ٠٠!

بەڵێ قورئانی پیرۆز لە ـ١١٤ـ سوورەت پێـك هاتووە ، وە ـ٦٦٦٦ـ ئایەتە ، وە ـ٧٦٤٤٠ـ ووشەیە ، وە ـ ٣٢٣٦٧١ ـ پیتە ، ئێمە لەم ـ٦٦٦٦ـ ئایەتەدا ، روناکی دەخەینە سەر ـ١ـ ئایەت ٠

الله الذی انزل الکتاب بالحق و المیزان ـ١٧ـ الشوری

وابو بە ـ١٤ـ سەدە کە موسولمانانی خاوەن بەهرەو ژیر قورئانی پیرۆز شیدەکەنەوە و لـــە واتـاکەی دا دەکۆلنەوە من نالێم لە ٩٠٪(٩) یان نەیان توانیوە بـە چاکیو بە پاکی سەربکەون و نازی ئایەتەکان رابگرن ، بەلام مافی خۆمە بلێم ، تائێستا لێکۆلینەوەیەـکی زۆر

تەواو نەکراوە بۆ ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز ، تائێستا ئەو سەرچاوە زانیاری‌و یاساییانەی کە لە گەلێنی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزن بە چاکی نەخراونەتە کارو نەکەوتونە دەست ئادەمیزاد هەندێکیان هەر دەستی بۆ درێژ نەکراوە ، بەلام ئەمە ئەوە ناگەیێنێت کە موسولمانان خۆیان ماندو نەکردوەو رۆشنبیریان کەمە ، بە پێچەوانەوە ، چڕی واتاکانی قورئانی پیرۆزو شێوەی داڕشتنی ئایەتەکان‌و مۆسیقای ئایەتەکان‌و نهێنی ، ئەم پیتە پچڕپچڕانەی کە کشاونە سەرەوەی سوورەتەکان، بەهێزترە لەو زانیاریەی کە ئادەمیزاد دەی زانێت ، واتە ـ ١٤٠٠ ـ سالە هێشتا زانیاری ئادەمیزاد نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە لە دل‌و دەروونی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بگات، ئایەتی ١٧ (الشوری)ش یەکێکە لەو ئایەتانەی قورئانی پیرۆز کە مافی خۆی وەرنەگرتوە بەلام لە دوای سالی ـ ١٩٦٥ ـ دا توانرا سەرەداوێك بدۆزرێتەوە لەم ئایەتەدا ، وە لە دوای سالی ـ ١٩٧٠ ـ شیَ دا سەرەداوێکی تر دۆزرایەوە هەر لە ئایەتی ـ ١٧ ـ

الشوری ـ دا ، بەلێ ئەگەر دەست بۆ توانای ئەم ئایەتە درێژبکەین رێمان دەکەوێتە سەر هـەر ـ ٣٢٢٣٦٧١ ـ پیتەکانی قورئانی پیرۆز ، چونکە قورئانی پیرۆز وەکـو لەشی ئادمیزاد وایە هـەموو بەشـەکانی تەواوکـەری یەکترن‌و هەمووی لێك‌بەستراوە بەهێزێك ، چ هێزێك کە تا دلی دنیاش لە لێدان بکەوێت ئـەم هێزە لە توانا ناکەوێت •

× × ×

**٨١١ـ٦٩٧:** ـ بفەرموون لەگەڵماندا با سەیری ئەم تابلۆیانە بکەین •

ئەگەر سەیری هەموو وشەکانی قورئانی پیرۆز بکەین کە ـ٧٦٤٤٠ـ وشەیە ، دەبینین وشـەی ـ الأیمان ـ بڕوایی ـ لە ـ٨١١ ـ جیگادا هاتووە پێچەوانەی ئەم وشەیە کە وشەی ـ الکفر ـ ٥ ـ بێ باوەری ـ لە ـ ٦٩٧ ـ جێگادا هاتوە •

تۆ بلێی چ نهێنیەك لەم دوو ژمارەیەدا هـەیە ، بەلێ جیاوازی نێوان ـ الایمـان و الکفر ـ باوەڕی‌و بێ‌باوەڕی ـ قورئانی پیرۆزە ، چونکە قورئانی پیرۆز

هەموو ئەرکێکی ئیسلامی تێدایە ، هەر کەسێك کـە ئیسلام بێت [ وەکو زۆربەی موسوڵمانانی ئیمڕۆ کە بە ـ الوراثة ـ یان بە ـجوغرافیەـ یان بە ـدفتر النفوس ـ ئیسلامن ] پەیڕەوی قورئانی پیرۆز نەکات گاورە ، ئەم هاوکێشە لەچیدا خوای گەورە بۆمان روون دەکاتەوە،خوای گەورە ئەم راستیەی خستۆتە پەیکەرێکی ئەندازەیی کە ئادەمیزاد تا ئیمڕۆ بیری لێ نەکردۆتەوە و بۆی نەچووە •

بەڵێ قورئانی پیرۆز ـ١١٤ـ سوورەتە ، ئێمـە ئەگەر وشەی ـ الکفر ـ کە ـ ٦٩٧ ـ وشەیە لـەم ـ١١٤ـ سوورەتەدا ، لە وشەی ـ الایمان ـ کە ـ٨١١ـ وشەیە لە هـەموو قـورئانی پـیرۆزدا دەربێنـین ، چ ژمارەیەکمان بۆ دەمێنێتەوە •

٨١١ ـ ٦٩٧ = ١١٤ •

ئەم ـ ١١٤ ـ یە چیە ؟؟ ، بەڵێ ئەم ـ ١١٤ ـ یە ژمارەی سوورەتەکانی قورئانی پیرۆزە ، واتە جیاوازی نێوان باوەڕی و بێباوەڕی قورئانی پـیرۆزەو بەس

بۆیەش خوای گەورە جیاوازیەکەی کردۆتە ـ١١٤ـ تاکو ئادەمیزاد بزانێت کە بڕوای هێناو پەیڕەوی کـردنی ـ١١٣ـ سوورەت لە قورئاندا گاورە تـاکو یـەکەکەی تریش بڕوایێ نەکات و پـەیڕەوی پێ نەکات چونکـە بڕواهێنان بە ـ٦٦٦٥ـ ئایەت، تەواوینە تاکو ـ٦٦٦٦ـ ئایەت نەبێت، قورئانی پیرۆز هەمووی بەیەکتر بەستراوە بە سوورەت و ئایەت و ووشە و پیتەکانەوە٠ هەمووشیان تەواوکەری یەکترین ، نهێنی نێوان ژمارەی ـالكفرـ و ـالإیمانـ لە قورئانی پیرۆزدا، نە لە سەردەمی محەمەدی پێشەوا و نە لە سەردەمی خەلیفەکانی راشیدین و نە لـە سەردەمی عەباسی و ئەمەویەکاندا ئەم نهێنیە نەدۆزرایەوە بەلکو لە دوای سـالی ـ١٩٦٥ـ دا دۆزرایەوە ، واتـە نزیکەی ـ١٤٠٠ـ سالە پاش هاتنە خوارەوەی ٠

ئەم تابلۆیە بە دەم و بە نووسین نەبێت بە هیـچ ریگای تر ئاسان نیە ، چ بـیرێك ، چ دکتـۆرێك ، چ فیلەسوفێك ، دەتوانێت لە نێوان ـ٧٦٤٤٠ـ ووشـەدا ـ٨١١ـ الایمانـ دابنێت و ـ٦٩٧ـ ووشەی ـالكفرـ

دابنێت ، کە جیاوازیەکەیان بەقەد ژمارەی سوورەتەکانی قورئانی پیرۆزە ، ئەمە ڕوویەکی وونە لە قورئانی پیرۆزدا کە هەزاران هەزار ڕووی وونی تری تێدایە .

بەلێ ئەگەر ووشەکانی ـالایمان الکفرـ زیاتر بانە ، یا کەمتربان لەم ژمارەیەی کە ئیمڕۆ لە قورئانی پیرۆزدا دەبینین ئەوا هەست بەلەنگیەك و کورتیەك دەکرا لە قورئانی پیرۆزدا بەلام چۆن چۆن ووشـەیەك زیاد دەبێت یان کەم دەبێت بەبێ هۆ لە کارێکدا کە خوای گەورە بیکات

دەبێ ـ ڕێکەوت ـ پەرستەکان چی بلێن لـــەم بارەیەوە ٨١١ ـ ٦٩٧ = ١١٤

**١٤٥=١٤٥**

بفەرموون سەیری ئەم تابلۆیانەش بکەن [١٤٥ = ١٤٥] کە چۆن ، چۆن بونەتە قومبەلەیەکی کشوەر بڕ ئەم سەرو ئەو سەری ماددیو وجوودیەکانیانی گرتوەو بەرەو قۆناغی مەرگیان دەبەن

ئەگەر سەیری هەموو ووشەکانی قورئانی پیرۆز بکەین دەبینین کە تەنیا لـــە ـ١ـ جێگادا ووشـــەی ـالصیفـ هاوین ـ هاتووە ، پێچەوانەی ئەم ووشەیە کە ووشەی ـالشتاءـ زستان لە ـ١ـ جێگادا هاتووە ، واتە دوو ووشەی پێچەوانە بەقەد یەکتر هاتوون لـــە هەموو قورئانی پیرۆزدا •

رحلة الشتاء و الصیف ٢ ـ قریش

الصیف = هاوین = ١

الشتاء = زستان = ١

★ ★

ئەگەر سەیری هەموو ووشەکانی قورئانی پیرۆز بکەین کە ـ٧٦٤٤٠ـ ووشەیە ، دەبینین ـ ٤ ـ جار ووشەی ـالبردـ ساردیـ(١٠) هاتووە ، پێچـەوانەی ئەم ووشەیە کە ـالحرـ گەرمی ـیە لە ـ٤ـ جێـگادا هاتووە واتە دوو ووشەی جیاوازو پێچەوانە ژمارەکانیان یەکسانن بەیەکتر لە هەموو قورئانی پیرۆزدا

البرد = ٤ = ساردی

الحر = ٤ = گەرمی

★ ★

بەلێ ووشەی – الموت ـ مردن ـ لە قورئانی پیرۆزدا لە ـ١٤٥ـ جێگادا هاتووە ، بەلام پێچـەوانەی ئەم ووشەیە کە ـالحیاةـ ژیان ـ لە ـ١٤٥ـ جێگادا هاتووە ، واتە ئەم دوو ووشەیە کە دژی یەکترن بەقەد یەکتر هاتوون لە هەموو قورئانی پیرۆزدا

الموت = ١٤٥ = مردن

الحیاة = ١٤٥ = ژیان

★ ★

## ئێرە دەنگی قورئانی پیرۆزە

ئەو دەنگەی کە هەرگیزاو هەرگیز لەکەی مردن ناگرێت ، بفەرموون با بەردەوام بین لە گەشتەکەماندا ·

ووشەی ـ الدنیا ـ جیهان – لە هەموو قورئانی پیرۆزدا لە ـ١١٥ـ جێگادا هاتووە ، پێچـەوانەی ئـەم

ووشەیە کە ـ الآخرة ـ دوارۆژ ـ لە ـ ١١٥ ـ جێگادا هاتووە

الدنیا = ١١٥ = جیهان [دونیا]

الآخرة = ١١٥ = دوارۆژ

تا زانست پێش بکەوێتەو رو ناکي زانیاری تاریکی نەخوێندەواری و داکەوتن رەش‌بکاتەوە ، زیاتر گەورەیی و وردەکاری خوای گەورەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە

* *

ووشەی ـالشیاطین ـ شەیتانـ لە هەموو قورئانی پیرۆزدا لە ـ٨٨ـ جێگادا هـاتووە ، وە ووشـەی ـ الملائکة ـ فریشتە ـلە ـ٨٨ـ جێگادا هاتووە واتـە بەیەکسانی هاتوون دوو ووشەی پێچەوانە

الشیاطین = ٨٨ = شەیتان

الملائکە = ٨٨ = فریشتە

* *

ووشەی ـ الرجس ـ واتە [ئەو کارە خراپەیەیە کە شەیتان توشی ئادەمیزادی دەکات] وە ووشەی ـالرجزـ

واته [ئەو ئازارەی کە ئادەمیزاد دەیبینێت ئەگەر بـە خراپە هەستا ، واتە توشی - الرجس - بوو] ئەم دوو ووشەیە لە هەموو قورئانی پیرۆزدا لە -١٠- جێـگادا هاتووە هەریەکەیان ، واتە بەیەکسانی

الرجس = ١٠

الرجز = ١٠

چۆن ، چۆن جێی خۆی نیە کە خـــوای گـەورە بفەرموویێت :-

- الله الذی انزل الکتاب بالحق والمیزان - ١٧ - الشوری

★ ★

ووشەی - النفع - بەکەلك - وە پێچەوانەکەشی ووشەی -الفساد- ئەم دوو ووشەیەی لە هەموو قورئانی پیرۆزدا بەیەکسانی هـاتوون ، هـەریەکەیان - ٥٠ - جارهاتوون

النفع = ٥٠

الفساد = ٥٠

★ ★

ژمارەی ووشەی – الصالحات[1] – لە هەموو قورئانی پیرۆزدا –١٦٧– ووشەیە ، پێچەوانەی ئەم ووشەیە کە ووشەی – السیئات – ژمارەکەی – ١٦٧ – ووشەیە ، واتە یەکسانن بە یەکتر دوو ووشەی پێچەوانە .

الصالحات = ١٦٧ = چاکە

السیئات = ١٦٧ = خراپە

★ ★

ژمارەی ووشەی – الضیق – لە هەموو قورئانی پیرۆزدا –١٣– ووشەیە ، پێچەوانەکەشی کە –الطمأنینە– ئەم ووشەیەش لە –١٣– جێگادا هاتووە ، واتە دوو ووشەی دژی‌یەك بەقەد یەك هاتوون

الضیق = ١٣ = دڵتەنگی

الطمأنینە = ١٣ = دڵنیایی ، دڵخۆشی

★ ★

ووشەی – محەمەد – لە هەموو قورئانی پیرۆزدا

لـ ـ٤ـ جێگادا هاتووە ، وە ووشەی ـ السراج ـ چرا ـ لە ـ٤ـ جێگادا هاتووە ، واتە ئەم دوو ووشەیە بە یەکسانی هاتوون

محەمەد (١٢) = ٤ (ص)

السراج(١٣) = ٤ = چرا

چەند لە جۆیتی‌و چەند رێکە کە ژمارەی ووشەی ـالسراج ـچرا ـ بەقەد ژمارەی ووشەی محەمەد بێت ، محەمەد هەر ئەو چرایە نەبوو کە لە سەردەمی ـجاهیلی ـ دا روناکی خستەسەر هـەمو سـوچێکی جیهـانو بەس ، بەلکو ئەو پێشەوایە مەزنەیە کە لەم سـەدەی بیستەمەدا واتە ـ١٤٠٠ـ سال پاش کۆچ‌کردنی پاش‌ئەوەی کە ئەم ئەستێرە جوانە بۆتە بنکەی قومبەلەی ئەتۆم ، بۆ تە بنکەی قوطبەلەی نیۆترون، بنکەی قازیفەی ـ المعبرة للقارات وذات رؤوس متعددة ـ ، بۆتە بنکەی رەگەز پەرستی ، رۆژنیە بە سەدان رەش‌پێست نەبێتە قوربانی سپی پێستێك ، هەموو جۆرە بێ یاسـاییەك دەکرێت ، کەربووین لەگەل ئاوازی ـ پێش کەوتن ،

پێش کەوتن کە چی ــ برناردشو ــ دەڵێت ــ ئەگەر محەمەد مابایە هەموو ئاژاوەیەکی سەرزەمینی چارەسەر دەکرد بەماوەی ئەوە کە فنجانێك قاوە بخواتەوە

بەڵێ ئەوە محەمەدە ، کە سەدەمی بیستەم بە دوای دەگەڕێت ، بەلام من لەگەل ــبرناردشۆــ نیم ، هەرگیزاو هەرگیز بروا بەوکەسانەش ناکەم کەوا دەزانن محەمەد مردووە ، برناردشۆ ئەگەرراست دەکات ئادەمیزاد توشی ئاژاوەو مەترسی بووە ،ئەگەر بۆچارەسەریان هەولدەدات، با باش بزانێت کە محەمەد ماوە !

محــــەمەد رۆژێك دەمرێت کە قــورئانی پــیرۆزو فەرمودەکانی بمرن ، هەمووشمان دەزانین کە قورئانی پیرۆز ئەزەلیە نەك مادەیە ! ، برنادشــۆ ئەگــــەر راست دەکات دەستی ئادەمیزاد بگرێتو بیان گەیێنێتە ژێر سێبەری ئایینی ئیسلام ، نەك ئەوها بێ هیوایان بکات ، بۆ ، بۆ محەمەد نەماوە ، محەمەد خوێندکارێکی دانیشگای قورئانی پیرۆز بوو ، محەمەد سەربازێك بوو پێشەواکەی قورئــانی پیرۆز بــوو ، محەمەد روبــارێکی

ڕوون بوو سەرچاوەکەی قورئانی پیرۆز بوو

ئەو کەسانەی دەیانەوێت کە محەمەد ببێنن چ ئادەمیزادێکی ژیر بووە ، چ کارێکی پەسند کردووەو چ کارێکی قەدەغە کردووە ، محەمەد بۆتە ـ٦٦٦٦ـ ئایەتو لە دەلاقەی زۆربەمانە فەرموو سەیریبکە چۆن، چۆن قسەت لەگەل دەکاتو بە ـ١٠ـ پەنجە ڕێگای بەختیاری و پێش کەوتنت بۆ دەست نیشان دەکات ٠

وما ینطق عن الهوی ان هو الا وحی یوحی

★ ★

ووشەی ـ الفرقان ـ بەو نامە دەلێن کە خراپەو چاکە لێك جیادەکاتەوە ، وە ووشەی ـ بنی ادم ـ کە ئادەمیزادە واتە ئەوکەسەی کە ـفرقانـ ی بۆ هاتووە ، ئەم دوو ووشەیە لە هەموو قورئانی پیرۆزدا بە یەکسانی هاتوون ٠

الفرقان = ٧

بنی ادم = ٧

★ ★

ووشەی ـ الاسباط ـ کـە کوڕەکـانی یەعقوب پێغەمبەرن ـ وە ووشەی ـالحواریون ـ کە یارانی عیسا پێغەمبەرن ـ ئەم دوو ووشـەیەش ژمـارەکانیان لـە قورئانی پیرۆزدا یەکسانە ، هەریەکەیان لە ـ٥ـ جێگادا هاتووە

الاسباط = ٥

الحواریون = ٥

★ ★

وە ووشەی ـ الناس ـ خەڵك ـ لە هەموو قورئانی پیرۆزدا لە ـ٣٦٨ـ جێـگادا هـاتووە ، وە ووشـەی ـ الرسل ـ پێغەمبەرەکان ـ لە ـ٣٦٨ـ جێگادا هاتووە ، واتە ژمارەی ووشەی ـخەڵكـ لەهەموو قورئانی پیرۆزدا یەکسانە بە ژمارەی ووشەی ـپێغەمبەرەکانـ .

الرسل = ٣٦٨ = پێغەمبەرەکان

الناس = ٣٦٨ = خەڵك

★ ★

ووشەی ـ العلم ـ زانیاری ـ لە هەموو قورئانی

پیرۆزدا لە - ٨١١ - جێگکادا هاتووە ، وە ووشـــەی - الایمان - باوەری - ل - ٨١١ - جێگادا هاتووە ، زانای بێباوەر بە -خوای گەورە - نەزانە ، ئادەمیزادێك نەزانێت کێ ،کێ دروستی کردوە، کێ - ئۆکسجینـی بەم ئەندازەیە لەسەر رووی زەمین دا داناوە کە نەهێندە زۆربێت کە ئاگر لە جیهان بەربداو نە هێندە کەمبێت کە بەشی هەناسەدان نەکات، کێ خۆری دروستکردووە کە پێویستە ماوەی دووریەکەی ئەوەندەبێت و بەس ، وە تیشەکـەی نەزیاد ، نەکـەم لە پێویست بێت ، ئەگەر خۆر چەند دوورە نیو ئـەوەندەی‌تر دووربـوایە تیشکەکەی هەموو خەلك‌و رووەك‌و ئاژەلی دەسووتاند ، ئەگەر چەند دوورە بەقەد نیوەی دوریەکەی لە ئێمـە دورتر بایە ، هـەموو خەلك‌و رووەك دەبووە شـەخنەو دەی‌بەست ، بەلێ زانینی بێباوەری نەزانینە •

العلم = ٨١١ = زانیاری

الایمان = ٨١١ = باوەری

★ ★

ووشەی ـالاصنام- بت ـلە ـ٧٦٤٤٠ـ ووشەدا لە ـ٥ـ جێگادا هاتووە ، وە ووشەی - الخمر ـئارەق ـ لە ـ٥ـ جێگادا هاتووە ٠

الاصنام = ٥ = بت[١٤]

الخمر = ٥ = ئارەق[١٥] ٠

چۆن ، چۆن لە جێی خۆیدا نیە کە خوای گەورە ناوی بتو ناوی ئارەق بە یەکسانی بێنێت ، ئەگەر بت پەرستی ئەوپەری بێهۆشی بێت ئەوا ئارەق خواردنەوەش زۆر لە بتپەرستی کەمتر نییەو بگرە زیاترە ، ئەم راستیە هەموومان دەیزانین بەلام خۆمان لێی کەر کردوە

لە ئارەق خۆرێك بپرسیت ئارەق چیە ؟

دەڵێت دلخۆشکەرەوەیە ، بفەرموون با پێکەوە سەیری ئەم دلخۆش کەرەوەیە بکەین ٠٠٠!

گەر لە خێزانی ئارەق خۆرێك بپرسیت ، ئارەق چیە ؟ دەڵێت منالەکانی لە ڕوتیانو لە برسان کوشتم ، باسی خاوەن قەردەکان مەکە کە چی دەڵێن لە دەرگاماندا ٠

با لەم پۆلیسە بپرسین کە لـە ـ بەرێوەبەرایەتی کشتی پۆلیسی هاتوو چۆی عێراقە ـ ئارەق چیە ؟

ئارەق بووە هۆی دروستبوونی ـ٣٠٩ـ روداوی وەرگەرانیو لێکدانی ئۆتۆمبێل لە ئەنجامی سەرخۆش بوونی شوفێرەکان ئەمەیان تەنیا لە نێوان سـالی ـ١٩٧٥ـدا

با لەم پۆلیسەش بپرسین کە لە ـ بەرێوەبەرایەتی کشتی پۆلیسە لە عێراق ـ ئارەق چیە ؟

نا ، باسی ئارەقتکرد ، تەنیا لە سالی ١٩٧٦ ـدا ـ٢٣٦٩ـ کەس بوونە بەراگێری

گەر لە پزیشکێك بپرسیت ئارەق چیە ؟

بۆ زیان لە کۆمپانیەکانی عێـراقو ئیسـلام بکەوێت ٠٠!

باشە ئەگەر لە دەولەتێکی ئیسلامیدا کە ژمارەی ـ١٠ـ ملیۆنـە لـە ـ٣٦٠ـ رۆژدا ، ٢٣٦٩ + ٣٠٩ کەس ببێتە قوربانی ئارەق خواردن ، دەبێت لە هەموو دەولەتە ئیسلامەکانی تر چەند کەس لە ناو ببـات ،

دەبێت لە هەموو جیهاندا چەند ئادەمیزاد بەقوربانی ئارەق بێت ، بەلێ ، بەلێ دوا راپۆرتی - مرکز الاحصاء -ی ئەمەریکا دەلێت گەنجەکانمان بەرەو شێتبوون دەچن بەهۆی ئارەق خواردنەوە چەند کەس شێتبووە ، وە دەلێت لە هەموو ساڵێك دا -٢٥- هەزار ملیۆن دۆلار بە ئارەق دەدرێت بەلام زیانەکەی دەگاتە -٥٠- هەزار ملیۆن دۆلار

مەلایەکی موسولمان ئەم سەرژمێرەی نەکردوە کە بلێین - پاشکەوتنە ، گەنجێکی موسولمان ئەم سەرژمێرەی نەکردوە کە بروانەکەین چونکە موسولمانە ، بەلکو ئەمە یەکێك پێمان دەنێت کە بروای بە خوای گەورە نیە

ئەگەر لە موسولمانێك بپرسین ئارەق چیە ؟ یەکسەر دەلێت حەرامە ، حەرامە چونکە خوای گەورە حەرامی کردوە ، خاوەن بروا دەزانێت کە خوای گەووە شتێك قەدەغە ناکات لە ئادەمیزاد کە زیان بە ئادەمیزاد نەگەیێنێت ، ئەو موسولمانەی کە دەلێت ئارەق

خواردنەوە حەرامە نازانێت ، نازانێت لە ـ١٠ـ ملیۆن کەسدا ـ ٢٣٦٩ + ٣٠٩ـ ئادەمیزاد بەراگیری ئارەق دەبێت ، ئەگەر کۆی ئەم ژمارەیە دابەشی سەر ـ٣٦٠ـ رۆژ بکەین دەبینین لە هەر ـ ١٨٠ ـ الـدقیقە ـ دا ئادەمیزادێك بە هۆی ئارەق خواردنەوە دەمرێت

ئەو رۆژەی کە خوای گەورە ئارەق خواردنەوەی حەرام کرد هەر موسولمانێك ڕووی لە ماڵەوە کـردو چەرە – گۆزەی ـ ئارەقی بلنـدکردو بـە زەویدادا ، بەڵێ ئەو رۆژەی کە ئارەق خواردن حەرام کرا شوڕەی جۆگەی ئارەق لە هەموو کۆلانەکانی مەککەو مەدینەدا دەنگی دەهات ـ ربنا واجعلنا مسلمین لك و من ذریتنا امه مسلمه لك

١٢٨ ـ البقره

× × ×

**ألم** — بفەرموون با لەگەل چەند تابلۆیەکی تردا بوەستین کە ڕوویەکی تری گەورەیی قورئانی پیرۆزمان بۆ دەگێرنەوە ٠

★ ★

ئەگەر سەیری سوورەی ـالبقرەـ بکەین کە لە ـ٢٦٨ـ ئایەت پێكھاتووە ، وە لە مەدینەدا ھـاتۆتە خوارەوە ، ئایەتی یەکـەمی ئەم ســوورەتە لـە پیتی - ألم ـ پێكھاتووە لێرەدا با پرسیارێك بکەین ، بۆ، بۆچی ئەم ئایەتە بە شێوەی - ألم - دەست پێدەکات بە ـ لأم - یان بە ـمألـ یان بە شێوەیەکی‌تر دەست پێناکات ، یان بۆچی بە ـأبتـ دەست پێناکات ئەم سوورەتە یان بە چەند پیتێکی‌تر ٠٠٠؟

پێش‌ئەوەی موسولمانێك بلێت ئەم دارشتنە کـە ـ الم - ە باشترەو رێكترە لە ھـەموو بۆ چـونێکی ئادەمیزاد چونکە خوای گەورە وای‌داناوە ١٠٠٠ ژیری ئەلەکترونی خۆی رەپێش دەکات‌و دەلێت ، ئـەم ـ٣ـ پیتە باشترەو راست ترە لە پیتەکانی‌تر بۆ ئەم ئایەتە، وە دەلێت ئەم ـ٣ـ پیتە کە بە شێوەی ـألمـ ھاتووە راست‌ترەو تـەواوترە لە ھـەموو دارشـتنێکی‌تر کـە ئادەمیزاد بۆی بچێت ، بۆ چونکە پیتی ـأـ لە سوورەی ـالبقرةـ دا - ٤٥٩٢ - پیتە وە ژمارەی پیتی - ل ـ

٣٢٠٤ - پیته ، وه ژماره‌ی پیتی ـم- ٢١٩٥ - پیته ، له هه‌موو سووره‌ته‌که‌دا ، واته که به شێوه‌ی - ألم - دانراوه ، به شێوه‌ی ـلأمـیانـ مأل - دانه‌نراوه ، راست‌ترەو رێك‌تره ، چونکه کام پیت ژماره‌که‌ی زیاتره له هه‌موو پیته‌کانی‌تر له سووره‌ته‌که‌دا له پێشـه‌وه‌ی ئایه‌ته‌که دانراوه ، وه کام پیت له پیتی ـأـ ژماره‌که‌ی زیاتره له ناو پیته‌کانی تردا له دوای پیتی ـأـ هاتووه که ـلـ ٥ وه کام پیت ژماره‌که‌ی لـه ژمـاره‌ی پیتی ـالـ که‌مترەو له ژماره‌ی هه‌موو پیته‌کانی‌تر زیاتره له دوای - أل - هاتووه ، ئه‌ویش پیتی ـمـ ٥

بیر له چی ده‌که‌یه‌وه - فه‌رخه سارته‌رو فرۆید -
بیر له چی ده‌که‌یته‌وه ، ئه‌مه هونراوه‌ی‌ـمایکۆفیسکی‌ـ نیه که ده‌لێت - خوا نه‌بێت هیچ شتێك قه‌دغه‌نیـه - باشه من له مایکۆ - ده‌پرسم چ سـودێك به خــوای که‌وره ده‌گات که ئاره‌ق خواردن قه‌ده‌غه‌یه ، گۆشتی به‌راز قه‌ده‌غه‌یه ، ئازار دانی دایك‌و باوك قه‌ده‌غه‌یه ، نه‌خوێنده‌واری قه‌ده‌غـــه‌یه ، کوشتنی بـه‌بێ تاوان

قەدەغەیە ، زینـــا قەدەغـەیە ! رۆژگرتن‌و نوێژو حەج‌و زەکـات و و ئەرکی پیرۆزن دەبێ جێبە جێ بکرێت

سودی ئـــەم ئەرك‌و قەدەغانە بۆکێن ، بۆکێن ماددیە بێرەگ‌و ریشەکان ، بێجگە لـــە ئادەمیزاد ، بەختیاری ئادەمیزاد پیش‌کەوتنی ئادەمیزاد

بیر لە چی دەکەیتەوە ، ئەم – ألم – ە رێکەوت دای‌ناوە یان ۰۰۰ یان ۰۰۰ چش ۰

بەلێ ئێرە دەنگی قورئانی پیرۆزە ، دانانی ئـــەم ـ٣ـ پیتە گەورەترین موعجزەیە کە تائیمرۆ ژیـری ئادەمیزاد نەگەیشتبوە ئەو ئاستەی کە بزانێت واتای چیەو بۆچی هاتووە ۰

أ = ٤٥٩٢

ل = ٣٢٠٤

م = ٢١٩٥

فان العزة لله جمیعا ١٣٩ ـ النساء

★ ★

سوورەی – ال عمران ـ کە – ۲۰۰ ـ ئایەتە لە مەدینەدا هاتۆتە خوارەوە ، ئایەتی یەکەمی ئـــەم سوورەتە لە ـ۳ـ پیت پێك هاتووە – ألم – ، ئـەم ـ۳ـ پیتە وەکور سوورەتی ـ البقرة – بەپێی زۆری‌و کەمی ژمارەکانیان پاش‌و پێش کراون ، نـــەك بــــە – عشوائی ـ یان بە – رێکەوت – دانرابن ، لەوکاتەی کە پیتی ـمـ لە دوای پیتی ـلـ هاتووە چونــکە ـ ژمارەی پیتی ـمـ لـــە سوورەی ـال عمران ـ دا – ۱۲۵۱ ـ پیتە ، کە پیتی ـلـ لە دوای پیتی ـأـ هاتووە چونکە ژمارەی پیتی ـلـ کەمترە لــــە پیتی ـأـ لە سوورەتەکەدا پیتی ـلـ ۱۸۸۵ – جار هاتووە وەپیتی ـأـ کە لەپێش پیتی ـلـ هاتووە ، چونـکە ژمارەی پیتی ـ أ ـ زیاترە لە ژمارەی پیتی ـلـ ، پیتی – أ ـ ۲۵۷۸ ـ جار هاتووە لەهەموو سوورەی ـ ال عمران ـ دا

أ = ۲۵۷۸

ل = ۱۸۸۵

م = ۱۲۵۱

م = ١٢٥١

قورئانی پیرۆز له ماوەی -٢٣- سالدا هـاتۆته خوارەوه به چەندان هۆو له چەندان کاتی ناخۆشیو خۆشی هـــاتۆته خوارەوه ، کـەچی نەك لـــەبارەی ناوەرۆکەوه که تائیمرۆ کەسێك نەبووه رەخنـــەی لێبگرێت ، تائیمرۆ چ یاساکـــانی کـــەتیایەتی چ زانیاریەکانی که باسیکردوه چ رێگاکانی که بۆمانی داناوه له کار نەکەوتووه ، وه لـــه بارەی دارشتنەوه بەجوانترینو وردەکاریترین شێوه دارشتراوه کـــــه ئادەمیزاد تائیمرۆ رۆژ به رۆژ و ســـال به ســـال گەوهەری به نرخ‌تری تێدا دەدۆزێتەوه

★ ★

ئەگەر سەیری سوورەتی ـ العنکبوت ـ بـکەین که له -٦٩- ئایەت پێکهاتووه ، ئـــەم سوورەته لەدوای سوورەتی ـ الروم ـ هاتۆته خوارەوه ، -١١- ئایەتەکەی سەرەتای سوورەتەکه نەبێت کـــه لـــه مەدینه هاتۆته خوارەوه -٥٨- ئایەتەکەی تر لـــــه

مەککەدا هاتۆتە خوارەوە ، ئـەم سوورەتەش ئایەتی یەکەمی بە پیتی ـألمـ دەست پێدەکات ، لێرەش‌دا وەکو سوورەتی ـالبقرةـ ال عمرانـ هۆی پاش‌وپێش کەوتنی ئەم ـ٣ـ پیتە بە پێی ژمارەکانیتیان لـــە سوورەتەکەدا •

٧٨٤ = أ

٥٥٤ = ل

٣٤٤ = م

★ ★

بەلێ سوورەتی ـالرومـ لـــە ـ٦٠ـ ئایـەت پێك‌هاتووە ، تەنیا ئایەتی ـ١٧ـ نەبێت کـە لـــە مەدینەدا هاتۆتە خوارەوە دەنا هەر ـ٥٩ـ ئایەتەکەی‌تر لە مەککەدا هاتۆتە خوارەوە ، یەکەم ئایەتی ئـــەم سوورەتەش وەکو سوورەی ـ البقرة ، ال عمـــران ، العنکبوت ـ لە ـ٣ـ پیت پێك هاتووە ـألمـ ، دانانی ئەم ـ٣ـ پیتە لەدوای یەکتر بەپێی کەمی‌و زۆری ژمارەکانیتی لە سوورەتەکە دا

أ = ٥٤٧
ل = ٣٦٦
م = ٣١٨

★ ★

سووره‌تی ـ الرعد ـ که ـ٤٣ـ ئایه‌ته ، لـه مه‌دینه‌دا هاتۆتـــه خواره‌وه ، له دوای سووره‌تی ـ محه‌مه‌د ـ دا هاتۆته خواره‌وه یه‌کســه‌ر ، ئایه‌تی یه‌که‌می ئه‌م سووره‌ته‌ش له چه‌ند پیتێك پێك‌هاتووه ، ـ ألمر ـ بۆته ئایه‌تی یه‌کـــه‌می سووره‌ته‌که ، وه دارشتنی ئه‌م چوار پیته لـــه‌دوای یه‌کتـــر به‌پێی که‌می‌و زۆری ژماره‌کانیتی که پیتی ـأـ لـه پێش پیتی ـلـ هاتووه ، چونکه ژماره‌که‌ی زیاتره لـــه ژماره‌ی پیتی ـلـ له سووره‌ته‌که‌دا ، وه کاتێك کـه پیتی ـلـ پێش پیتی ـمـ هاتووه ، ژماره‌که‌ی لـه سووره‌ته‌که‌دا زیاتره له ژماره‌ی پیتی ـمـ ، وه‌کاتێك که پیتی ـمـ له‌پێش پیتی ـرـ هاتووه ، ژمـاره‌ی پیتی ـمـ زیاتره له ژماره‌ی پیتی ـرـ لـه

سووره‌ته‌كه‌دا

أ = ٦٢٥
ل = ٤٧٩
م = ٢٦٠
ر = ١٣٧

★ ★

هه‌ست به‌چی ده‌كه‌یت له‌م تابلۆیانه‌ی كه‌ جێمان هێشت ، جگه‌ له‌ ده‌سه‌لاتی خوای گه‌وره‌ به‌سه‌ر هه‌موو شتێكدا :ـ

به‌لێ تادوێنێ ئه‌م پیتانه‌ به‌سه‌دان جۆر شێده‌كرانه‌وه‌ یه‌كێك به‌ ناوی خوای گه‌وره‌ی داناوه‌ یه‌كێك به‌ ـ سوندی ـ ده‌زانی كه‌ خوا ده‌یخوات ، یه‌كێك به‌ نهێنی نێوان خوای گه‌وره‌و پێغه‌مبه‌ری ده‌زانی ، مه‌لا محه‌مه‌دی كۆیی به‌ هه‌لاوی داده‌نێت له‌ نێوان خوای گه‌وره‌و پێغه‌مبه‌ر یه‌كێكی‌تر وای‌ده‌زانێت ـ له‌ كاتێكدا كه‌ خوای گه‌وره‌ داوای له‌ گاوره‌كان كرد ئه‌گه‌ر ئێوه‌ راست ده‌كه‌ن قورئانی

پیرۆز لەلایەن خـوای گـەورەوە نەهاتووە ، دەئێوە قورئانێکی وابێنن ، وە کــە دەلێت ـ الم ، المر طە ، یس ، ن ق ٠ حم هتد ئەوە بۆ ئەوە یـە کـەهـانیـان بدات بزانـن کـە قورئـانی پیرۆز لـە پیتەکانی وان‌دا هاتووە بۆ ، بۆیێیان ناکرێت کــە قورئانێك بێنن

بەلام ئیمرۆ بۆمان ڕوون بۆوە کە ئەم پیتانــە زۆر دوورن لەو شیٚ‌کردنەوانەی کــە بۆیان کراوە ، بەلکو ئەم پیتانە گەورەترین موعجزەیە کە لـەتوانای ئادەمیزاد دا نیە

لە تەکمابووی ، خۆت دیتت کــە ئەم قورئانە پیرۆزە تاکــە پیتێــکی پاش‌وپێش نەکراوە ، بـە تەرازوێکی وا هەستیار کــە بە ـ ئەلەکترۆنێك ـ سەردەکات

بەلێ پاش‌وپێش نەکردنی ئەم پیتانەی کەدیتت زەنگێکی زولالە لــــەم هۆلی سەدەی بیستەمە کـە ئادەمیزاد هوشیار بێتەوە و بزانێت ، لەلای خــوای

کەور هیچ جوولانەوەیەك ، هیچ چاکەو خراپەیەك ون نابێتو پاشوپێش نابێت .

★ ★

بفەرموو با سەیری ئەم شارە وونەش بکەین کە ئیمڕۆ نازانیت کەوتۆتە کام سوچی جیهان ، سەیرکەو بیر بکەوە کە چۆن ، چۆن ڕێزی قورئانی پیرۆزیان گرتووەو چۆن ئەزبەریان کردووە

کە هیشامی سێیەم ، خەلیفەی ئیسلام بوو لە سەردەمی ئەمەویەکاندا لە قورتوبە ، ویستی ژن بهێنێت ، بڕیاریدا کە کچێکی دەوێت قورئانی پیرۆزی لەبەربێت ، شەوێکیان دانا کە لەم شەوەدا هەرماڵێك کە کچێکی هەبێت قورئانی پیرۆزی لەبەر بێت با مۆمێك لەسەر دەرگاکەی پێبکات ئەو لێژنەیەی بۆ ئەم کارە دانرابوو پاش نوێژی شێوان چوونە دەرەوە بۆئەوەی بزانن چەند مۆم پێکراوە ، کە لێژنەکە گەڕایەوە بۆلای خەلیفە بۆیان گێڕایەوە کە -٧٢١- مۆم پێکرابوو .

بەڵێ تەنیا لەشارێکی ئیسلامدا – ٧٢١_ کچ قورئانی پیرۆزی ئەزبەرەو ئامادەشە کە تاقیی بکەنەوە دەبێ ژمارەی ئەو ژنو کورو پیاوانە چەندبێت کە قورئانی پیرۆزیان لەبەرە لە قورتبەدا ، یان لە هەموو خاکی ئیسلامدا

کە خەلیفە ئەمەی زانی بریاریدا هەر کچێکی کە قورئانی پیرۆزو _ موطا _ ی ئیمامی مالیکی لەبەربێت من ئەوم دەوێت ، شەوێك بۆ ئەممەبەستە دیاریکرا کە هەرماڵێك کچەکەی قورئانی پیرۆزو [موطا]ی لەبەرە با مومێك لەسەر دەرگای دەرەوەی پێ بکات

کە لێژنەکە چوونەدەرو سەیریانکرد ، سەیریان کرد کە _٥١٢_ مۆم پێکراوە ، بەڵێ تەنیا لە شارێکی ئیسلامدا لە ئەوروپا _٥١٢_ کچ قورئانی پیرۆزو [موطا]ی لەبەرەو ئامادەیە کە تاقیش بکرێتەوە

کاکی ئیسلام بابو باپیرانی ئێمە بەمجۆرە

لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا هەستانەو دانیشتون بۆیە ،
بۆیە قورتوبە کــە لــە دلی کیشوەری ئەوروپایە
پایتەختیان بووە ، سەیرکەن چۆن ، چۆن گــەلی
ئیسلام هەولی داوە کە خوێندەواری لەناو خوشکەکاندا
بلاوببێتەوە ، سەربەستی ئافرەت لەوەدایە کە کچێك
تەمەنی ـ١٥ـ سال بێت قورئانی پیرۆزی لەبەربێت کە
لەتەلۆکی ئەم بوونەوەرەیە ، لەگەل - موطا - کــە
سەرچاوەیەکی ڕوونە لە فەرموودەکانی محەمــەدی
پێشەوا

ئەگەر گاورو ماددیە سەرلێشێواوەکـان لــە
سەدەی ـ٢٠ـ دا سەربەستی ئافرەتیان بلاوکردەوە ،
با باش ئادەمیزاد بزانێت کە خوای گەورە ـ١٤٠٠ـ
سال لەمەوبەر سەربەستی ئافرەتی دەست نیشـان
کردەوەو رای پەراندوە بە خاوەن برواکان

**١٩**

تائێمرۆ نەمان دەزانی بۆ ، بۆلەپێش هــەموو
سوورەتێکدا - بسم الله الرحمن الرحيم - دانراوە ،
نــەم هەموو - بسم الله الرحمن الرحيم - نــە

بۆچی باشه ، یا بۆچی هاتووه ، هـــەر ئەوەندەمان لێدەزانی کە سەرەتایی سوورەتەکان بەناوی خـوای گەورە دەست پێدەکات ٠

بەلێ لەدوای ـ١٤٠٠ـ ســال ئادەمیزاد توانی بگاتە سەرە داوێك لەنهێنی ئەم هەموو ـ بسم اللـه الرحمن الرحیم ـ انە ، بەلام دەبێت زۆرباش بزانـین کەخوای گەورە ئەم نهێنیەی بەئێمە گەیاندوە پێش ـ ١٤٠٠ ـ سال ، کەچی ئادەمیزاد نەگەیشتۆتە ئـەو ئاستەی کە بۆی بچێت ٠

بەلێ لە سوورەتی ـ المدثر ـ دا لەئایەتی ـ٢٩ ، ٣٠ ـ دا خوای گەورە دەستی لەسەر ئـەم نهێنیـە داناوە کەچی هیچ موسولمانێك لەسەردەمی محەمەدو لەسەردەمی ئەمەوی‌و عەباسی‌و بەر لـــە ـ١٩٧٠ـ دا هـــەستی بەمـــە نەکردوە ، بەلام ، گەنجێکی میسری ـ د ٠ رشاد خلیفە ـ تاکە سواربوو کە خۆی گەیاندە ئـــەم جیهـــانە وونەو توانی بەشێوەیەکی سەرکەوتوانە چەند ڕوویەکی ئیمجازی قورئانی پیرۆز

بدۆزێتەوە

د • رشاد دەڵێت ـ بسم الله الرحمن الرحیم ـ پێك‌هاتووە لە ـ١٩ـ پیت ، ئەم ژمارە ـ١٩ـ یە تەرازوێکە کە گەورەی قورئانی پیرۆزمان بۆدەگێرێتەوە کە چۆن ئەوماوە درێژەی بریوە بەبێ کەمو کورتی‌و زیادو کەمی •

د• مصطفی محمود ـ یش[١٧] دەڵێت ئەم ژمارەیە ژمارە ـ١٩ـ هەر ئەوژمارەیەیە کە لە ئایەتی ـ ٢٩، ٣٠ ـ سوورەی ـ المدثر ـ هاتووە

من لەگەل د• مصطفی[١٨] محمود م کە ئـــەم ژمارە ـ ١٩ ـ یەی لە ـ المدثر ـ هاتووە ، هەر ئەو ژمارە ـ ١٩ ـ یەیە کە د• رشاد خلیفە دۆزیتیەوە بەرێگای ژیری ئەلەکترۆنی

بەڵێ ئەم ژمـارە ـ١٩ـ یەی کـە دەی‌بینیت تەرازوێکە کە هـەرپیتو ووشـەیەکی بـەسەرا دابەش‌بکەین بەبێ کەرت دەمێنێتـەوە ، خـۆ ئـەگەر کەرتێك ماوە ئەوە دیـارە زیادو کـەمیەك ڕوویداوە

لەکاتی هاتنی قورئانی پیرۆز بۆلای ئێمە چ لەسەر دەمی محەمەدی پێغەمبەرمان و خەلیفەکانی راشیدین کە لەسەر ڕووی کاغەز نە دەنووسرایەوە یا لەسەردەمی ئەمەوی و عەباسیەکان کە لەسەر ڕووی کاغەز دەنووسرایەوە یا لە چەرخی رەشدا کە پشکریکی وای نەبوو خۆی پێوە خەریك بکات یا لەسەردەمی عوسمانیەکاندا یا بەر لە سالی - ١٩٧٠ ـ دا ئەم هەلەیەی تێکەوتووە

بفەرموون با کەمێکیش لەگەل ئەم تابلۆیەدا بوەستین ژمارەی سوورەتەکانی قورئانی پیرۆز ـ١١٤ـ سوورەتە ئەگەر ژمارە ـ١١٤ـ دابەشی سەر ـ١٩ـ بکەین دەبینین کە هیچ کەرتێك نامێنێتەوە واتە سوورەتەکانی قورئانی پیرۆز تائیمرۆ هیچ زیادو کەم نەبووینە ، ئەگەر سوورەتێك زیاد ببا یان سوورەتێك کەم ببا دابەشی سەر ـ١٩ـ نەدەبوو بەبێ کەرت

## ســـوورەتـەکـان = ١١٤ ÷ ١٩ = ٦

★ ★

بابزانین ژمارەی ـ بسم الله الرحمن الرحیم ـ دابەشی سەر ـ١٩ـ دەبێت ، لەپێش ـ١١٣ـ سوورەتدا ـ بسم الله الرحمن الرحیم ـ هەیە ، تەنیا سوورەتی ـالتوبەـ نەبێت ـ بسم الله الرحمن الرحیم ـ لە پێشی نیە ، بەلام لە سوورەتی ـ النمل ـ دا دوو ـ بسم الله الرحمن الرحیم ـ هەیە ، یەکێکیان لەپێش سوورەتەو یەکێکی تر لە ئایەتی ـ٣٠ـ دا ـ انه من سلیمن وانه بسم الله الرحمــن الرحیـم ـ واتە دوو ـ بســم الله الرحمن الرحیم ـ هەیە ،واتە لە هەموو قورئانی پیرۆزدا ـ١١٤ـ بسم الله الرحمن الرحیم ـ هەیە ، ئەم ژمارەیەش دابەش سەر ـ١٩ـ دەبێت بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك، واتە ژمارەی ـ بسم الله الرحمن الرحیم ـ لە قورئانی پیرۆزدا هیچ زیادو کەمیەکی تیا نەکەوتووە بەدەقی‌خۆی ماوەتەوە ٠

بسم الله الرحمن الرحیم = ١١٤ ÷ ١٩ = ٦ ٠

زانیمان کە ژمارەی سوورەتەکان و ژمارەی
- بسم اللە الرحمن الرحیم - هیچ کەمو کورتیەکی
تیا نەکەوتووە و بەدەقی خۆی ماوەتەوە ، بابزانین
ووشەکانی - اسم ، اللە ، الرحمن ، الرحیم[19] - ٠
دابەش سەر -١٩- دەبن بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك٠؟

بەڵێ لە هەموو قورئانی پیرۆزدا ووشەی -اسم-
لە - ١٩ جێگادا هاتووە واتە دابەشی سەر - ١٩ -
دەبێت بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك

اسم = ١٩ ÷ ١٩ = ١

ئەگەر سەیری ووشەی - اللە - بکەین دەبینین کە
لە ٢٦٩٨ جێگادا هاتووە ، ئەم ژمارەیەش دابەشی
سەر -١٩- دەبێت بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك ٠

اللە = ٢٦٩٨ ÷ ١٩ = ١٤٢

وە ووشەی -الرحمن-[20] لەهەموو قورئانی
پیرۆزدا لە -٥٧- جێگادا هاتووە ، ئەم ووشەیەش

دابەشی سەر ـ١٩ـ دەبێت بەبێ مـــانەوەی هیـــچ کەرتێك

الرحمن = ٥٧ ÷ ١٩ = ٣

وە ووشەی الرحیم(٢١)ـ لـــە ـ١١٤ـ جێگـــادا هاتووە لە قورئانی پیرۆزدا ئەم ژمارەیەش دابەشی ـ١٩ـ دەبێت بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك

الرحیم = ١١٤ ÷ ١٩ = ٦

کاکی ئیسلام خۆت دیتت کەچۆن ، چۆن لـــە سوورەتی ـالبقرەـ دا تەنیا پێنێك پاش‌وپێش نەبووە، خۆت دیتت کەچۆن ژمارەی سوورەتەکانی قورئانی پیرۆزو ژمارەی ـ بسم الله الرحمن الرحیم ـ و ژمارەی ووشەی ـ اسم ، الله ، الرحمن ، الرحیم ـ بەدەقی خۆیان ماونەوە تائیمرۆ بەبێ زیادبوون‌و کەم‌بوون ، ئەمە وانەبێت تەنیا ئەمانە بەدەقی خۆیان مابنەوە و بەس بەلکو ئایـــەتی یەکەم لـــە زۆربەی سووزەتەکانی کە بەپیت دەست پێدەکەن بەدەقی خۆیان ماونەوە .

بفەرموو لەگەڵمان باتێنوویەتی دڵمان بشکێنـــین

لـەم شیرناوانەی کـە ئامێری ئـەلەکترونی کرنۆشی بۆ دەبات

★ ★

سوورەتی ـقـ ، ئایەتی یەکەمی ئەم سوورەتە پیتی ـقـ٥ ژمـارەی پیتی ـقـ لـەم سوورەتەدا ـ ٥٧ـ پیتە ، ئەم ژمارەیەش دابەشی سەر ـ١٩ـ دەبێت بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك

ق = ٥٧ ÷ ١٩ = ٣ ٠

ئەگەر بەوردی سەیری ئەم سـوورەتە بکـەین وردکاری و گەورەی ئەو ئەندازیارەمان بۆ روون دەبێتەوە کە قورئانی پیرۆزی داناوە ، سەیرکەن خوای گەورە لە ـ١٢ـ جێگادا ناوی گەلو نەتەوەی ـلوطـ دەهێنێت، لە ـ١١ـ جێگادا بە ـ قوم لوط(٢٢)ـ ناوی بـردووە بەلام لە جاری ـ ١٢ ـ دا کە لە سـوورەی ـقـ بـە ـ اخوان لوط ـ ناویان دەبـات ، بۆ ، بـۆچی نـا پرسیت بۆ لێرەش دا خوای گەورە بە ـ قوم لوط ـ

ناویان نابات و به ـ اخوان لوط ـ ناویان دەبات بۆ ، بۆ ؟

خوای گەورە لەپێش دوو سوورەت دا ـالشوری، ق ـ پیتی ـ ق ـی داناوە وەکـو دەزانین کە هـەر پیتێك لەم سوورەتانە دا دەبێت دابەشی سەر ـ١٩ـ ببێت بەبێ مانەوەی هیـچ کەرتێك خۆ ئـەگەر کەرتێك ماوە وادیارە زیادیو کەمیەك لە قـورئانی پیرۆز دایە

بەلێ ژمـارەی پیتـی ـق لە سـوورەی ـق ـ دا ـ٥٧ـ ـق ـ ە ئەگەر خوای گەورە لێرەش دا ـ قوم لوط ـ بە اخوان لوط ـ نەهێنێت بە ـ قوم لوط ـ بهێنێت ژمارەی پیتـەکانی ـق ـ دەگـاتە ـ٥٨ـ ق

واتە دابەش سەر ـ١٩ـ نابێت بەبێمانەوە ، ئەمـە لەلایەك وە لەلایەکی ترەوە ژمارەی پیتی ـق ـ لـە سوورەی ـق ـ دا ، زیاتر دەبوو لە ژمارەی پیتی ـق ـ لە سوورەی ـ الشوری ـ دا کە ژمارەی پیتی ـق ـی ـ٥٧ـ ق ـ ە

ق = ٥٧ ÷ ١٩ = ٣ ٠

★ ★

سوورەی ـ القلم ـ ئایەتی یەکەمی ئەم سوورەتە پیتی ـن ـ٥ ، ژمارەی پیتی ـن ـلە سوورەی ـالقلم ـدا ـ١٣٣ـ پیتە ، ژمارەیەش دابەشی سەر ـ١٩ـ دەبێت بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك

ن = ١٣٣ ÷ ١٩ = ٧ ٠

ئەگەر ـ١٣٢ـ پیتی ـنـ هاتبا تـەنیا ـ١ـ پیت نەبووبا ئیمڕۆ کەلێنێك دەکەوتە ڕووی قورئانی پیرۆز ، یان ئەگەر ـ١٣٤ـ پیتی ـنـ لە سوورەتەکەبا ، دیسان کورتیەك لە قورئانی پیرۆز بەدیار دەکـەوت ، بـــەلام چۆن کورتیـەك لەکارێـکدا دەبێت کـەخوای گـەورە بیکات ٠

★ ★

ئەگەر سەیری سوورەی ـیسـ بکەین دەبینـین کە ٠ ئایەتی یەکەمی ئەم سوورەتە لەپیتی ـی ـ ، س ـ پێك هاتووە ، ئەگەر ژمارەی ئەم دووپیتە کۆ بکەینەوە

دەبینین دەکاتن ـ٢٨٥ـ پیت ، ئەم ژمارەیەش دابەشی سەر ـ١٩ـ دەبێت بەبێ مانەوە ٠

(ی + س) = ٢٨٥ ÷ ١٩ = ١٥ ٠

کاکی ئیسلام لەهەر کوێهەی چەکی شانت با قورئانی پیرۆز بێت ، راپۆرتی رامیاریت با قورئانی پیرۆز بێت ، بۆهەموو کارێك لەژیانتدا بکەرێوە سەر قورئانی پیرۆز ئەو قورئانەی کەئیمرۆ ئاتەشی رۆژهەلاتو رۆژئاوا گۆرەشانی دەدمن کەچی ، کەچی بەهێزە ـ کامنە ـ کەیەوە خۆی راگرتووەو رۆژنیە لەچینی رەشو رووت(٢٣) لە چینی زاناکان(٢٤) لەچینی ئادەمیزاد بەگشتی خۆیان هەرباز نەکەنو خۆیان نە کەبینە ژێر سێبەری ئیسلامی پیرۆز ، کە قورئانی پیرۆز رامیاریەتی ، ئەو قورئانە پیرۆزەی کە ژیری ئەلەکترونی لە سەدەی بیستەما کەوتە کرنۆش بردن بۆ گەورەیی ، بەلێ ئەگەر تەنیا پیتێكلە پیتی ـ س ـ یان پیتێك لە پیتی ـی ـ لە سوورەی ـ یس ـ زیاتر با یان کەمتر با لەو ژمارەیەی کە خوای گەورە دای ناوە

ئیمـــرۆ نەك هەست بەکورتیەك دەکرا لـــە قورئانی پیرۆز بەلـکو رۆژنامەو گوڤاری بێباوەرە ســـەرلێ شێواوەکان دنیایان بەســەری دەگـەراندین بـەلام چۆن چۆن خوای گەورە تەنیا پیتێك زیادو کــــەم دادەنێت بەبێ واتا



ئەگەر سەیری سوورەی ـ طه ـ بکەین کە ئایەتی یەکەمی لەپیتی ـ ط هـ ـ پێك هـاتووە دەبینین کەژمارەی پیتی ـ ط ، هـ ـ لە سوورتەکەدا دەکـات ـ٣٤٢ـ پیت ، وە ئەم ژمارەیەش دابەشی ســـەر ـ١٩ـ دەبێت بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك

(طه + هـ) = ٣٤٢ ÷ ١٩ = ١٨

ئەم پیتەی کەئیمرۆ دەیبینیت بۆتە قومبەلەیەکی نیۆترۆنی کیشوەر پڕ ئەو سەرو ئەم سەری جیهانی ماددیو وجودیە بێرەگەکانی گرتووە دوێنێ شتێکی تربوو ئەگەر سەیری ـ تفسیر ـ ە کـانی قورئانی پیرۆز بکەیت کـە ئــەم ئایەتانەیان ـ پیتەکان ـ

شیَ کردۆتەوە بەسەدان بۆچونیان هـــەیە لەسەری
یەکێکیان دەلێت ـ طه ـ واتــە ئــەی ئادەمیزاد
یەکێکی‌تر دەلێت واتە ئەی محەمــەد ، هەندێـــکی‌تر
دەلێن مانای وایە ئەم سوورەتە سوورەتی ـطەـ یـە
واتە ناوی سوورەتە ، بەگشتی مانای ئەوەیە کـــــە
تائێستا ئادەمیزاد نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی لـــــە
گەورەیی قورئانی پیرۆز بگات

★ ★

ئەگەر سەیری سوورەی ـ مریم ـ بکەین کـــە
ئایەتی یەکـــەمی لەپیتی ـ ك ، هـ ، ی ، ع ، ص ـ
پێك هاتووە ، دەبینین ژمارەی ئەم ـ٥ـ پیتـــە لە
هەموو سوورەتەکەدا دەکاتە ـ٧٩٨ـ پیت ، وەئـــەم
ژمارەیەش دابەشی سەر ـ١٩ـ دەبێت بەبێ مـانەوەی
هیچ کەرتێك .

(ك + هـ + ی + ع + ص) = ٧٩٨ ÷ ١٩ = ٤٢

★ ★

ئەگەر سەیری سوورەی ـ الرعد ـ بکەین کـە

ئایەتی یەکەمی لەپیتی ـألمرـ پێکهاتووە دەبینین کە ژمارەی ئـــەم ـ٤ـ پیتە لەهەموو قورئانی پیرۆزدا دەکات ـ١٥٠١ـ پیت وەئەو ژمارەیەشی دابەشی ســەر ـ١٩ـ دەبێت بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك

أ + ل + م + ر = ١٥٠١ ÷ ١٩ = ٧٩

★ ★

ئەگەر سەیری سورەی ـ الشوری ـ بکەین کــە ئایەتی یەکەم و دووەمی لە پیتی – حم عسق – پێـــك هاتووە ئایــەتی یەکــەمی ـحمـ وە ئایــەتی دووەمی – عسق – ە ، لێرەدا پرسیارێك دەکەین ، بۆ ، بۆچی لە سوورەی ـ مریم ـدا ـ٥ـ پیت بۆتە یەك ئایەتـ – كهيعص – کەچی لە سوورەی ـالشوریـ دا بۆتە دوو ئایەت

لە وەلامی ئەم پرسیارەدا ڕوویەکی ترمــــان بۆ ڕوون دەبێتەوە لە ئیعجــازی قورئانی بــیرۆز ، لەکاتێکدا کــە خوای گــەورە ـ كهيعص ـ ی لەسوورەی ـ مریم ـ دا کردۆتە یەك ئایەت چونکە ،

ژمارەی ئەم ـ٥ـ پیتە لەهەموو سوورەتەکەدا دەکات ـ٧٩٨ـ وە ئەم ژمارەیەش دابەش سەر ـ١٩ـ دەبێت بەبێ مانەوەی هیچ کورتێك ، بەلام لـــە ســوورەی ـ الشوری ـ دا کـــە ـ٥ـ پیت بۆتە دوو ئایەت ـ حم ، عسق ـ چونکە ئەگەر ژمارەی هەر ـ٥ـ پیت کۆکەینەوە دابەشی سەر ـ١٩ـ نابێت بـەبێمانەوە ، بۆیە خوای گەورە ئەم ـ٥ـ پیتەی کردۆتە دووئایەت ، با ـحمـ جێبێلین ژمارەی پیتی ـعسقـ لەهەموو سوورەتەکەدا دەکات ـ٢٠٩ـ پیت ، وە ئەم ژمارەیەش دابەشی سەر ـ١٩ـ دەبێت بەبێ مـــانەوەی هیچ کەرتێك

(ع + س + ق) = ٢٠٩ ÷ ١٩ = ١١

★ ★

ئەگەر سەیری ئایەتی یەکـــەمی ســـوورەی ـ الشوری ، المؤمن ، فصلت الزخرف ، الدخـان ، الجاثیـــة الاحقاف ـ بـــکەین دەبینین ئەم ـ٧ـ سوورەتە ئایـەتی یەکـەمیان پیتی ـحمـ ٥ [لەیادت

نەچێت ـحمـ ی کە جێشمان هێشت لە ـالشوریـ دا ] ژمارەی پیتی ـحمـ لە هـەر ـ٧ـ سوورەتدا دەکات ـ٢١٦٦ـ ، ئەم ژمارەیەش دابەشی سەر ـ١٩ـ بکەین دەبینین کەهیچ کەرتێك نامێنێتەوە

(ح + م) × ٧ = ٢١٦٦ ÷ ١٩ = ١١٤

★ ★

# دوا تابلۆ

لە پێشەکی ئەم نامیلەیەدا وتمان کـە قورئانی پیرۆ کەتەلۆکی ئەم بوونەوەرەیە ، ئەمە وانەبێت کەماوە نەدرێت قسە لـە سـەری بکرێت بـەلکو هـەر کـەسێك بروا ناکـات کـە قورئانی پیرۆز کـەتەلۆکی ئـەم بوونەوەرەیە با تاقی بکاتەوەو لێی بکۆلێتەوە تاکو بکاتە راستی ئـەو راستیەی‌کەلای زۆربەمان تالە

خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا باسی هەمـوو

نەتەوەیەکی کردوە چۆن ژیاوون چۆن لەناوچوون بۆ لەناو چوون ، لەکوێ دەژیان ، وانەبێت هەر باسی رابردوی ئادەمیزادی کردبێت بۆئیسلامو بەس بەلکو باسی داهاتووی کردوە کە چۆن لەناو دەچینو چون سزای رۆژی دوایی دەبینین ، گرنگی قورئانی پیرۆز لەم بارەوە ئەوەیە کە باسی هەر نەتەوەیەك دەکات باسی پێغەمبەرەکەشی دەکات وەگرنگتر لە وەشدا ئەوەیە باسی نەتەوەکانی رابردوو یەك لەدوای یەك دەکات وەکو زنجیرە و بەبێ پسانەوە ، تاکو ئادەمیزاد بزانیت کامیان لەکامیان کۆنترەو تازەترە

بفەرموون با سەیری ئەم تابلۆیە بکەین کە چۆن باسی – اصحاب الكهف – دەکات

ـ ولبثوا في كهفهم ثلث مائة سنين وازدادوا تسعا ـ ٢٥ – كهف

کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە گاورەکانی هەموو جیهان وتیان ئەمە درۆیە ، چونکە لە – تەورات و ئنجیلو زەبووردا – تەنیا ـ ٣٠٠ – سالە ئەم ـ٩ـ

یە درۆیە ، با جارێکی‌تر سەیری ئایەتەکە بـــکەین ، دەبینین کـە خوای گەورە نـەی‌نووسیوە بە ـ٣٠٩ـ بەڵکو بە ـ٣٠٠ـ ناوی بردوەو دەڵێت ـ٩ـ ش زیاد بوو ، واتە ـ٣٠٠ـ و ـ٩ـ کەی بەجیا نووسیوە ، ئەم نهێنیە تائیمڕۆ نەزانرابوو ، بەڵام لەم ساڵانەی دوایدا زانیـــاری وەلامی گاورەکانی داوە ووتی تەوراتو ئینجیلو زەبوور بەساڵی ڕۆژی هاتۆتە خوارەوە کـــــە ژمارەی ڕۆژەکانی ساڵێکی ـ٣٦٥ر٢٣٢٢١٧ـ ڕۆژە واتە کەباسی مانەوەی ـ اصحاب الکهف ـ دەکات لە نەشکەوتەکەدا بـە پێی ســالی ڕۆژیە ، بەڵام قورئانی پیرۆز بە ساڵی مانگی هـاتۆتە خوارەوە ، وە ژمـارەی ڕۆژەکانی ساڵی مانگی ـ ٣٥٤ر٣٦٧٠٦٨ـ ڕۆژە ، واتە کەباسی ئەم مانەوە دەکات بەپێی ساڵی مانگی دەیکات ، وە هەمووشمان دەیزانین کە جیاوازی نێوان ساڵی ڕۆژی‌و ساڵی مانگی لە ساڵێکدا ـ١٠ـ ڕۆژە ٠

٣٦٥ر٢٣٢٢١٧ ـ ٣٥٤ر٣٦٧٠٦٨ = ١٠ر٨٧٥١٤٩

ڕۆژە ٠

باشه جیاوازی نێوان سالی مانگی و سالی رۆژی له سالێکدا ـ١٠ـ رۆژبێت ، کەواته له ـ١٠٠ـ سالدا دەکات ـ٣ـ سال ، باشه ئەوان ـ٣٠٠ـ سال مانەوه له ئەشکەوتەکه ـالکهفـ کەواته :ـ

١٠٠ + ٣ + ١٠٠ + ٣

+ ١٠٠ + ٣ = ٣٠٩

ـ جاء الحق وزهق الباطل ان الباطل كـــان زهوقا ـ

× × ×

## کێ کێ ،

هەموومان دەزانین که قورئانی پیرۆز چاپ نەکرابوو تاکو بەیەك جـــار بۆ محمەدی پێشەوا بێتــه خوارەوه بەلکو لەمـاوەیەکی درێژدا هـاته خوارەوه کـه ـ ٢٣ ـ سال بوو محــمەد نەخوێندەوار بوو نەی دەزانی که بینووسێتەوه بەلکو که ئایەتەك یان ـ١٠ـ ئایـەتی بۆ دەهاتــه خوارەوه دابەشی سەر یارەکانی خۆی دەکرد تاکو بینووسنەوەو

لەبەری بکەن ، هەمووشمان دەزانین کـــە لە ســـەر کاغەزی سپی نەدەنوسراوە ، بەلکو لە بەرد لـە دارلە ئێسقان لەپێستە دەنووسرایەوە ، لەم شار دەچـــوو بۆ ئەم شارو لەم دێ رەوانەی ئەو دێ دەکرا ، بـــەم جۆرە قورئانی پیرۆز ملی رێگای گرتو هاتە خوارێ ، وا لەم قۆناغەی دا واتە کە ـ١٤٠٠ـ سالە بەرێوەیـە لەگەل یەکتر گەیشتینە یەك ، و پێناسەیەکی نوێمان بۆ دۆزیەوە ، ئەویش دینامیکیەتە لە دلی ئایەتەکـانی قورئانی پیرۆز ، ئەو دینامیکیەتەیە کە ـ١٤٠٠ـ سالە بەبێ پشوودان بەرێوەیە ، تەنیا یەك پیتی لەکـــاز نەکەوتووە ، تائێستا یاسایەك کـــە قورئانی پیرۆز هێناویەتی دژی زانیاری نەبووەو دژی پێشکـــەوتن نەبووە •

خۆت لەگەلمان بوری کە چۆن پاشوپێش کردنی پیتێك نەکراوە لە قورئانی پیرۆزدا ، ئەگەر تەنیـــا ـ١ـ پیت لە سوورەی ـ یسـ لە ئایەتی یەکەم زیاد ببا ئیمرۆ کەلـــەنێك ، کورتیـــەك لەرووی قورئانی

پیرۆزدا بەدی دەکرا کێ ، کێ توانی لەم کاروانـە رەش‌و دژوارەدا ئەم ئەندازەیـە بپارێزێت ، کێ ، کێ دای‌ناوە سوورەی ـ البقرة ـ لــە سەرەتای قورئانی پیرۆزبێت ، سوورەی ـ ال عمران ـ لە دوای سوورەی ـ البقرة ـ بێت چونکە ژمارەی پیتەکانی ـالم ـ ی ـالبقرةـ زیاترە لە ژمارەی پیتەکانی ـالمـ لــە ـ ال عمران ـ دا ، کێ ، کێ ـالمـ ی داناوە کە بەم شێوەبێت ، کە بە پێی کەمی‌و زۆری ژمارەکانیـــان هاتوون ، کێ ئەم پیتانەی پاراست کـــــە پاش‌وپێش نەکەوون ، کێ قــوم ـلوطـ ی لەسوورەی ـقـ دا بە ـ اخوان لوط ـ هێنا ، کێ ، کێ لە ســـوورەی ـ الشوری ـ دا پیتی ـحمـ ی کردە ئایەتی یەکـەم و پیتی ـ عسق ـ ی کردە ئایەتی دووەم •

بەڵێ ئەو مەچەکەی کە ئەم ئەندازەیەی داناو ئەو مەچەکەی کە ئەم پەیکەرەی پاراست ، خوای گەورەیە ، ئەو خوایەیە کە دەفەرموویت •

انا نحن نزلنا ذكر وانا له لحافظون

٩ـ الحجر

★ ★

که قورئانی پیرۆز کرا مەدالیاو لـــە مل محەمەدو گەلی محەمەد کرا ، هەموو گاورەکانی جیهان بەرهەلستی ئەم دەنگە نوێیەیان کـــرد ، دەمێك بــــە نووسینی محەمەدیان دادەنا کەچی محەمەد لەخوێندەواربوو ، دەمێك بە سحریان دادەنا ، دەمێك بە شعریان دادەنا ، بەلام ، بەلام خـــوای گـــەورە بۆ ئەوەی بۆیان ڕوون بکاتەوە کە ئەم نامــــە پیرۆزە دەست نووسی ئادەمیزاد نیە ، ڕووی تێکردن و فەرمووی ، کـــە ئێوە قورئانی پیرۆز بە نووسینی ئادەمیزاد دەزانن ، بۆ نامەیــــەکی وەکو ئەم نامە پیرۆزە نانووسن

فلياتوا بحديث مثله ان كانوا صادقين

٣٤ـ الطور

ئەگەر راست دەکەن ، بەلام پێیان نەکراو بۆیان نەچووە ســـەر ، کەچی بەردەوام بوون لەگالتە کردن

بـه ئايينى ئيســلامى پيرۆزو قورئانى پيرۆز ، خواى گەورە جاريكى‌تر بۆى ڕوون كردئەوە كە لەم قورئانـه پيرۆزه دەست نووسى ئادميزاد نيـــەو گـــەورەترين موعجزەى خواى گەورەيه ، بۆيه پێى ووتن ئەگـــەر راست ئەكەن ئێوه له سەر راستين بۆ ئەنيـــا ـ١٠ـ ســـوورەت ئانووسن وەكـــو سوورەتى قورئانى پيرۆزبێت ٠

قل فاتوا بعشر سور مثله مفتريات

١٣ ـ هود

چۆن پێيان نەكرا ـ ١١٤ ـ ســـوورەت بێنن نەيان توانى ـ١٠ـ سوورەتيش بێنن ، كـــەچى پەتى نەزانيتيان بەر نەداو بەردەوام بوون له بلاوكردنەوەى پڕوپاگەندە بەدواى محەمەد و يارانى محەمـــــەد و قورئانى پيرۆز ، زۆر جاريش ئازاريان دەدان ، بۆيه ، خواى گەورە زۆر ، زۆر بەپاكى بۆ ڕوون كردەنەوە كـه قورئانى پيرۆز لەرەووانەى خۆيـــەتى‌و دوورە ، دووره لەخامـەى ئادەميزاد ، بۆيـه پێى ووتن ئـەنيا ـ١ـ

سوورەت بێنن لە سوورەتی قورئانی پیرۆز بچێت ٠
فاتوا بسورة من مثله ـ٢٣ـ البقرة
بەلام چۆن چۆن نەیان توانی کـــە ـ١١٤ـ
سوورەت بێنن ، چۆن ، چۆن نەیان توانی کـە ـ١٠ـ
سوورەت بێنن ، ئەوهـاش نەیان توانی تەنیـا ـ١ـ
سوورەت بێنن ، کە لە ـ٣ـ ئایەت پێك هاتووە ، کـە
ـ٢٠ـ ووشە زیاتر نیە ٠

ئەو داواکاریانە لە یەکێك نەدەکرا کە نەخوێندە
واربێت لەگەلێکیش نەدەکرا کـــە نەخوێندەواربن
بەلکو داوا لەهەموو بێباوەرێکی سەرڕووی زەمین دەکرا
ئەم بێباوەرانەش بەهەزاران هۆنەریان هەبوو ، بـــە
هەزاران رەوانبێژو ووتاربێژیان هەبوو زانای وابەرزیان
هەبوو لە زمانو لەرێزمان کەتادنیا دنیایە گەلی عەرەب
زانای وایان نابێت ، ئەو جـــۆرە ئەدیبە بەرزانەیان
هەبوو کە ـ١٤٠٠ـ ساڵ پێش ئیمرۆ میهرەجـــانی
ئەدەبیان دەگێرا لەبازێری ـ عوکاز ـ دا ، چـەندان
ووتارو هونراوە تیایە دەخوێندرایەوە جوانترین و

درێژترین هونراوەیان بەدیواری - کەعبـــە - دا هەلدەواسی ، تاکو وەکو - ڕۆژنامـــەو گۆڤارەکانی - ئیمرۆ خەلك بیان خوێنێتەوە - المعلقات - ، ئەگـــەر سەرۆك خێلێك نوێنەرێکی ناردبا بۆلای ســـەرۆك خێلێکی ناسیاو ، ئەوا هۆنەرێکیان دەنارد ، چونـــکە هۆنەر دەیزانی بەچاکی‌و بەپاکی چ دەنگ‌و باسێك‌و کارێك هەیـــە بەرێگای هونراوەدا دایڕێژێ‌و بیگەیێ نێت کەچی خـــاوەنی ئەم‌هـــەموو هێزە ڕەوانبێژو زمان‌ناس وهۆنەرەبوون نەیان توانی تەنیا -٣- ئایەت بێنن وەکو ئایەتی قورئانی پیرۆز ٠

بەلێ گەلی عـــــارەب دەیان توانی لەسەر یەك کێش‌و سەروادا و بە یەك مۆسیقا هونراوەیەك دانێن بە قـــەد -١٠- قورئانی پیرۆز - درێژبێت ، بەلام قورئان شعر نیە ، دەیان توانی کە ووتارێك بنووسن بەقـــەد -٣٠- هێندەی قورئانی پیرۆزبێت بەلام قورئانی پیرۆز ووتارنیە ، باسەیری داواکانی خوای گەورە بـــکەین جارێکی‌تر - بحدیث مثله ، بعشر سور مثله ، بســـور

من مثله ـ لێرەدایە ، گەورەترین نهێنی لێرەدایە
خوای گەورە نافەرمووێت نامەیەکی وەکو قورئانی
پیرۆز گەورە بهێنن بەڵکو دەڵێت نامەیەکی وەکو قورئانی
پیرۆز بهێنن لەبارەی ناوەرۆکو شێوەی و ئەندازەی
دارشتنی وەکە دەفەرمووێت ـ١٠ـ سوورەت بێنن یان
ـ١ـ سوورەت بێنن هەر بەوشێوە داوا دەکات کە
وەکو قورئانی پیرۆزبێت لەبارەی ناوەرۆکو شێوەی
دارشتن ، بەڵێ بۆیە ، بۆیە بۆیان نەکرا کە ـ١ـ
سوورەت بێنن وەکو سوورەتی قورئانی پیرۆزبێت ،
باشە من زۆرباش بروام بەوە هەیە کە بەر لە سالی
ـ١٩٥٠ـ دا کەسێك نەبوو بزانێت بۆ بۆ ـالمـ
بەشێوەی ـالمـ هاتووە ، بە شێوەی ـمالـ نەهاتووە
وە باشیشی دەزانم کە بەر لە سالی ـ١٩٥٠ـ دا کەسێك
نەبوو بلێت لە هەموو قورئانی پیرۆزدا ـ٤ـ جار ووشەی
ـ البرد ـ ساردی ـ هاتووەو ـ٤ـ جار ووشەی
ـ الحر ـ گەرمی ـ هاتووە ، وە بڕواش بەوە دەکەم
کە تاکەنجێکی کوردی موسولمان سەرچاوەکانی ئەم

نامیلکه یا ئەم نامیلکە نەخوێنێتەوە لەم بارەوە نازانێت
با لــە ساڵی ـ١٩٧٨ـ تیش بێت ، جـا چۆن چۆن
ـ هیند و درێژ و لبید ـ لەم بارەیان دەزانی ، وا دیارە
کە ئاگاداری ئەم هەموو یەکسانیو ئەم تەرازوە هەست
دارەش نەبوونە ، تەنیا هەر لەبارەی واتا بەرزەکەیو
شەپۆلی مۆسیقاکـــەی بوو کـــە نەیان دەتوانی یەك
سوورەت بێنن وەکو سوورەتی قورئانی پیرۆز ، بـــەڵێ
ئەمەیە قورئانی پیرۆز ٠

ئەم داواکاریانەی خوای گەورە هەر بۆ گاورەکانی
سەردەمی محەمەدی پێشەوا نیە و بەس ، بەلکو ئیمرۆ،
با بێباوەرەکـــانی ـ ئۆکرالیاو بەکینو واشنتەن ـ
قورئانێکی وادابنێن کـــە وەکو قورئانی پیرۆز بێت ،
ئیمرۆ خـــاوەنی هەزاران فیلیسوفو دکاترەو ئامێری
چاپەمەنیو ئەلەکترۆنین ، بەلام با زۆر باش بزانن تەنیا
ـ١ـ تاکە سوورەتیان پێ نانوسرێت وەکـــو سوورەتی
قورئانی پیرۆزبێت بۆیە ، بۆیە خـــوای گـــەورە
دەفەرموێت ٠

قل لئن اجتمعت الانس والجن على ان ياتوا بمثـل
هذا القرآن لا ياتون بمثله ولو كـــــان بعضهم لبعض
ظهيرا                    ٨٨ ـ الاسرى

# تێبینی

١ ـ بەڵێ هەموو فەرموودەکانی خوای گەورە
ئـەزەلین ـ قورئـان ، ئینجیـل ، زەبوور ،
تەورات ـ وە ئەونامانەی بۆ ـ ئادەمو ابراهیم ـ یش
هاتی نەتە خوارەوە

٢ ـ تائێستا بەچاکی ڕوون نەبوویتەوە کە چەند
سوورەت لەشاری مەککە هاتۆتە خوارەوە و چەند لـــە
مەدینەدا ، هەندێك دەڵێن ـ٢٠ـ سوورەت لە مەدینـە
هاتۆتە خوارەوەو ئەوانی تر لە مەککە ، بـەلام من بە
پێی سوورەتەکانی کـەلە قورئانی پیرۆزدا نووسراون
ـ مکی ، مدنی ـ دام ناوە

٣ ـ یەکەم ئادەمیزاد ئادەم بوو ، یەکەم پێغەمبەر

ئادەم بوو ، واتە لە هیچ کاتێکدا ئادەمیزاد بەبێ ڕابەر نەبووە

٤ - لە بارەی ژمـــارەی پێغەمبەرەکانەوە لەقورئانی پیرۆزدا تەنیا ناوی - ٢٥ - پێغەمبـــەر هـــاتووە ، ناوی چـەندانی تریش نەهاتووە ، واتە ژمارەکەیان دیارنیە و نازانرێت •

- منهم من قصصنا علیك ومنهم مـــن لم نقصص علیك - ٧٨ - غافر

٥ - محەمەد براو خوشکی نەبوو ، لەزگی دایکی بوو کە باوکی مرد ، شەش سالان‌بوو کە دایکی مرد کورەکانیشی بە منالی مردن •

٦ - لبید بەگەورەترین‌و ناودارترین شـــاعیری - جاهیلی - ناسرابوو کە گوێی لە قورئانی پیرۆز بوو چیتر شیعری دانەنا تەنیا دێرێك نەبێت کەپێیان ووت بۆ شیعر دانانێیت ووتی کەمـــن شیعرم دادەنا هیچ ئەدیبێك نەبوو شیعری وەکومـــن دابنێت ، بـــەلام قورئانی پیرۆز سەرچاوەکەی ووشك کردم چونـــکە

ڕەوانبێژی و هونەری لە شیعری من گەورەترە ٠

٧ ـ ئوبەی کوری خەلەف ـ تاکە کەسێکە لەم زەمینە کە بە دەستی محەمەدی خۆشەویستمان کوژراوە

٨ ـ هەر مادەیەکی کە تۆ دەی بینیت بەهەر ـ٣ـ بەشەکەیەوە وە ئەو یاسایەی کەبۆی دانراوە چ لە بارەی زۆری و کەمی چ لە بارەی جولانی ، هەمووی بەڵگەی گەورەیی خوای گەورەن ،هەموو هاوار دەکەن ـ لا الە الا اللە محمد رسول اللە ـ

ـ وإن من شي الا يسبح بحمده ـ٤٤ـ الاسراء

٩ ـ کەلێک ـ تفسیر ـ و لێکۆلینەوەی بەهێزیشتمان هەیە وەکو ـ فی ظلال القرآن ـ روح البیان ، مراغی ، هتد ٠

١٠ ـ کە دەلێین ووشەی ـ البرد ـ لە هەموو قورئانی پیرۆزدا ـ٤ـ جار هاتووە یان ـالایمانـ ٨١١ ـ جار هاتووە ٠ ٠ ٠ ،واتە ووشەی ـ البرد ، الایمان الموت ، بە هەموو ـ مشتقات ـ ە کانەوە ـ

ـ ووشـەلێ وەرگیراوەکانـەوە ـ دەکـات ـ٤ـ یـان ـ ٨١١ ـ یان ـ٦٩٧ـ جـاز ، وە لەمـەردوا هـەر ژمارەیەکی کەدێتت بە ـمشتقاتـە کانیەوەیە

١١ ـ لـە قورئـانی پیرۆزدا ـ ١٨٠ ـ جـار ـ صالحات ـ هاتووە ، بەلام ـ٤ـ جار بـە ـصالح (ص) ـ وە ـ ە ـ جار بە ـصالحاـ هاتووە واتـە ـ٩ـ جار ناوی صالح پێغەمبەرە ، وە لەم ـ٤ـ

ئایەتەش دا [٢ ـمحمـد ٩٠ ـ الانبیـاء ٥ ـ محمد ، ١٥ـ الاحقاف] بە واتای چارەسەری یان چارەکردن هاتووە واتە ـ١٣ـ جار بـەو واتایـە نەهاتووە کە پێچەوانەی ـ السیئات ـە ،بەلکو ـ١٦٧ـ جار بە ـصالحات هاتووە

١٢ ـ محمد ـلەم ـ٤ـ ئایەتەدا هاتووە [١٤٤ـ العمران ٢ محمد ، ـ٤ـ الاحزاب ٢٩ ـ الفتح]

١٣ ـ ووشەی ـالسراجـ لە ـ٤ـ جێگادا هاتووە [٤٦ـ الاحزاب ، ١٣ـ النبا ، ١٦ـ نوح ، ٦١ـالفرقان]

١٤ ـ ووشەی ـالاصنامـ لەم ـ٥ـ جێگایـەدا

هاتووه [١٣٨ ـ الاعراف ، ٣٥ ـ ابراهيـم ، ٧٤ ـ الانعام ، ٧١ ـ الشعراء ، ٥٧ ـ الانبياء]

١٥ ـ ووشەی ـ الخمر ـ ئەم ـ٥ـ ئايەتـەدا هاتووه [٢١٩ ـ البقرة ، ٩٢ ـ المائدة ، ٩٠ـ المائدة، ٣٦ ـ يوسف ، ٤١ ـ يوسف] بەلام لەئايەتی (١٥ ـ محمد) [وانهار من خمر لذة للشاربين] لێرەدا خوای گەوره لەگەل ئارەقی حەرامی نيه بەلكو لەگەل ئارەقی بەهەشتی يەتی هەربۆيەش ووتم ـ٥ـ جـار ناوی ئارەقی هاتووه نەك ـ٦ـ جار

١٦ ـ نووسەری پێشكەوتوو خوازی ئيسـلام ـمحەمەدی مەلا سالحی شارەزوری ـ لەناميلكەی ـ ئايا قورئان دانـانی محـەمەده ـلـەم بـارەوه دوابوو وه دەتوانم بلێم يەكەم نووسەری كورده كـه لەم بارەوه چەند ڕوويكی خستته سەرچشت ٠

١٧ ـ بروانه گوڤاری ـ صباح الخير ـ ژمـاره ـ١٠٥٦ـ ٠

١٨ ـ كـه دەلێم مـن لـەگـەل د مصـطفی

محمود ـم که دەلێت ئەم ـ۱۹ـ ەیە کـە لەئایـەتی
ـ۲۹ ۳۰ ـالمدثر ـ هاتووە

ـ لواحه للبشر ، علیها تسعه عشر ـ

لەبەر ئەم هۆیەیە لە ـ الایمان و العلم الحدیث،
وە لە ـ تفسـیری مجـیـد فرید ـدا ئەم ئایەتـە بۆ
باوکی خالیـدی کوری ولید ـ هـاتۆتە خـوارەوە ـ
ولیدی کوری موغیرە ـ چونکـە دەیگوت ئـەم قورئانە
قسەی ئادەمیزادە ، وە خوای گەورەشی کە دەفەرموێت
ـدەی کەمە ناو دۆزەخ وە ژمارەی ـملائکەـ کانی بـە
ـ۱۹ـ هێناوە وە پاشان دەفەرموێت

ـ وما جعلنا عدتهم الا فتنه للذین کفروا ـ مدثر
واتە ئەم ـ۱۹ـ یە کە ـژمارەی ـملائکەـ کـانی
سـەر دۆزەخـە فتنـەو بەلایەکە بـۆ کاورەکان ، وە
باسەکەشی هەر لەسەر قورئانی پیرۆزە ، بۆیە ، بۆیە
من لەگەڵ ئەوەدام کە ئەم ـ۱۹ـ یە هەر ئەم ـ۱۹ـ
یە بێت کەلە ـ۲۹ـ ، ۳۰ ـ المدثر ـ ە ٠

۱۹ ـ دەبێ باش بزانیت کە وشەی [اسم ، الله،

الرحمن الرحيم] ی کە باسی دەکەین ، ئەو وشانە نین کە لە هەر -١١٤- بسم الله الرحمن الرحیم - ە واتە بێجگە لە - بسم الله الرحمن الرحیم - کەلە -١١٤- جێگادا هاتووە وشەی [اسم ، الله ، الرّحمن الرحیم]ی تێدایە

٢٠ - د رشاد خلیفە دەڵێت لە هەموو قورئانی پیرۆزدا -٣- جار وشەی - بسم - هاتووە ، وە -١٩- جار وشەی - اسم - هاتووە - وە ئەگەر ژمارەی وشەی - بسم - لە - اسم - بدەین ٣ × ١٩ ژمارەی وشەی -الرحمن- دەردێت واتە -٥٧- وشەی -الرحمن- لە -٥٧- جێگادا هاتووە

٢١ - خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا وشەی -الرحیم- ی [بێجگە لە هەر -١١٤- بسم الله الرحمن الرحیم -کە- الرحیم -ی تێدایە] لە -١١٥- جێگاو هێناوە بەڵام دەبێ بزانیت کە تەنیا -١١٤- سیفەتی خوای گەورەیە وە یەکێکیان سیفەتی محەمەدی خۆشەویستمانە -١٢٨- التوبە

ـ بالمؤمنين رؤف رحيم ١٢٨ ـ التوبه

واته تەنیا ـ ١١٤ ـ وشەی ـ الرحیم ـ هاتووه

٢٢ ـ بەلێ ـ قوم لوط ـ لە ـ ١١ ـ ئایەتە هاتووه [٣٣ ـ قمر ، ١٢ ـ ص ، ٢٨ ـ العنكبوت ، ٥٤ ـ ٥٦ ـ النمل ، ١٦٠ ـ الشعراء ٤٣ ـ الحج ، ٧٠ ـ ٧٤ ـ ٨٩ ـ الهود ، ٨٠ ـ الاعراف] بەلام لە سوورەی ـ ق ـ دا لە ئایەتی ـ ١٣ ـ بە ـ اخوان لوط ـ هاتووه

و عاد فرعون واخوان لوط ١٣ ـ ق

٢٣ ـ رۆژنامەی ـ نیویورك تایمز ـ لە رۆژی ١٠ ـ ٥ ـ ١٩٦٢ ـ دا لە ژێر سەردێری ـ ٢٠ ملیۆن زنجی بوو بە موسولمان ـ لە لاپەڕەی یەكەمدا نووسیبوی ، رۆژ نیە كە كۆمەڵێك رەشپێست نەبێتە موسولمان ، چونكە موسولمانای رەشپێست لە ئەمەریكادا ئارەق خواردن و ـ القمار ـ بێ ناموسی و هەموو كردەوەیەكی خراپیان وازلێ هێناوە ، وە جولەكەكانی فەلەستین ـ ٤ ـ ملایین دۆلاریان داناوە بۆ

هەریەکێك کە ـکلاوـ ببەزێنێت ، بەلام ئەو پاڵەوانانەی کە چوینە بەرانبەری بەبێ شەویلاکی هاتووتەوە

و کان حقا علینا نصر المؤمنین

٢٤ ـ بروانە ـ الله یتجلی فی عصر العلم ، و العلم یدعو للایمان ٠

## سەرچاوەکان

١ ـ القران الكريم
٢ ـ الاعجاز العددى للقران الكريم ـعبدالرزاق نوفل٠
٣ ـ القران و العلم الحديث ـعبدالرزاق نوفل
٤ ـ الايمان و العلم الحديث ـمحمد حسين الاديب ٠
٥ ـ حكم التحريم الخمر فى الاسلام
٦ ـ مجله ـاخر ساعه ـ عدد ـ ٢١٤٩ ـ ١٩٧٥ ٠
٧ ـ مجله ـ صباح الخير ـ عدد ـ ٢٠٥٦ ـ ١٩٧٦
د٠ مصطفى محمود
٨ ـ اشهد ان هذا القران من عندالله ـ محمود محمد غريب

## سوپاس

- سوپاس بۆ پارێزەر - ئەنوەر محەمەد حەسن -
- سوپاس بۆ حامید سۆفی و عومەر غەریب و فەیسەل عوسمان و عەلی محەمەد کارگەچی
- سوپاس بۆ خۆشنوسی لاو عبدالباسط فەرهادی .

× × ×

## پێناسەکەم

یەکەم چاپکراوی (بەکر غەریب بەرزنجی) یە

ناونیشانی نووسەر

هەولێر گەڕەکی سێتاقان (خەبات) مزگەوتی سەید غەریب .

یاخود

هەولێر ص.ب -٦٨-

رقم الايداع في المكتبة الوطنية ببغداد ١٣٠ لسنة ١٩٧٨